ناوەڕۆک

پێشەکی

ساڵانێک خولیای ژیانو بەرهەمەکانی نالی لووتکە بووم. لە باپیرمەوە زۆرم لە سەر بە توانایی ئەم مەزنە ئەبیست. ئاگاداری زۆر بۆنەو دانیشتن بووم، کە تەرخان ئەکران بۆ باسکردنی بەرهەمەکانی ئەم مەزنە. ئەمە جگە لەو بڵاوکراوانەی لە سەردەمێکدا بووبوونە وێردی سەر زمانی توێژی خوێندەواران. هەر لەو سەردەمەوە بە پشتیوانی هەوڵەکانی مامۆستا بەرزو بەڕێزەکانی، وەک: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسو مەسعود موحەمەد، کە کۆمەڵگەی کوردیان زیاتر بە نالی ئاشنا کرد. بواریان بۆ چەندین باسو لێکۆڵینەوەیتر خۆشکردو ئەوەندەیتر دیدو بۆچوونەکانی هەوادارانی نالییان دەوڵەمەندتر کرد.

لەو سەردەمەوە هەر جارەو داهێنانو بابەتێکی نوێ لە شاکارەکانی ئەم مەزنەدا بەدی ئەکرێن. وایکردووە هونەرمەندە دەنگ خۆشە بەتواناکانی نەتەوەکەمان شاکارەکانی ئەم مەزنە بکەنە سۆزی دەروون چریکەی نەبڕاوەو خزمەتی هونەری کۆمەڵگەی کوردی پێبکەن.

دیوانی نالی لە گرنگترینو بەسوودترین کتێبێک بوو لە ساڵی **١٩٧٦** دا بە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی شایستەوە کەوتە دەستی خوێندەواران. پاشان دەستەو دامەنی نالی، چەپکێک لە گوڵزاری نالی، کە بە رادەیەکی زۆر بەرفراوانتر مەلا خدر ئەحمەد شاوەیسی میکایەڵی (نالی) بە کۆمەڵگەی کوردی ناساند. بە پێی ئەو دیوانە نالی لە نێوان ساڵی **١٧٩٧** و **١٨٠٠** لە گوندی خاکو خۆڵی شارەزور لە دایک ئەبێت، تاوەکو ئێستا چەمی شاوەیس لە گوندەکەدا ناوی باپیری نالی ون نەکردووە. لە شیعرەکانی ناو دیوانی نالیدا زۆر بواری مێژوویی، ئەستێرە ناسیو

ماتماتیکو ئایینو ستراتیژیەتی نووسینو بواری سەربازیو بەڕێوەبردنو پێناسەو قەڵەمڕەویو دەوڵەتو وشەئاراییو زمانەوانی ... هتد بەدی ئەکرێن.

نالی وەک دامەزرێنەری پێوگەی کلاسیکیی شیعری کوردی، تاکو ئێستا کاریگەریی بەسەر نووسینو بیرو بۆچوونی شاعیرانو نووسەرانو رووناکبیرانی گەلەکەمانەوە دیارەو لە بواری هونەری دەرخستنی رۆشنبیریو شارستانیشدا رەنگدانەوەیەکی ئاشکرای هەیە.

سەرەتا لە دیدێکی رۆشنبیریو شارستانیو کولتوورییەوە گرنگیم بە تێڕوانین لە ژیانی کۆمەڵایەتیو کەسایەتیو داهێنانو زمان پاراوییەوە بۆ نالی زیاتر بوو، وەک لەوەی گرنگی بە مێژووی لە دایک بوونو مردنو دانانی شاکارەکانبێت. ئەو بابەتانەم بە ئەرکی کەسانی پسپۆڕی مێژوو، ئێرکیۆڵۆژیای مرۆڤایەتیو شوێنەوار ناسەکان ئەزانی. ئەوەندەی بە لای منەوە گرنگ بوو ئەو تێڕوانینە سۆسیۆلۆژیەیە دیارە بوو، کە نالی درکی پێکردووەو بەو شێوازە کردوونی بە بنەمای چەسپاندنی زمانی کوردی لە نووسینو ئاخاوتندا.

شیعرەکانی نالی ئەکرێت لە چەندین روانگەوە پۆلێن بکرێن: لە رووی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەوە. لە رووی دەسەڵاتو دارشتنی پێگەی نەتەوەییو کۆمەڵایەتیەوە. لە رووی پێشکەوتنی رۆشنبیریو شارستانیو کولتوورەوە. لە رووی بەرزی ئاستی بیری هزرمەندانەو دەسەلاتی لە رادەبەدەری ئەو زانیاریو زانستانەی بە دەستی هێنابوون.

دیارە لە یاساو رێساکانی سۆسیۆلۆژیدا چەندین سەردەمو رەوش هەیەو ئەتوانرێت لێوەی بگەینە چەندین دەرەنجامو مەبەستی دیاریکراو. لەوانە دایەلۆگو

هەڵسەنگاندنو بەراوردو ڕێکخستن، تاوەکو بەدواچوونو گەشەو پێشکەوتن ئاشکرابنو گۆڕانکاریو چارەسەر بەردەوام بێت. ئەم لایەنانە بوونیان لە بنەمای بەرهەمەکانی نالیدا هەیە. بۆیە توانیویەتی سنووری سەردەمی خۆی بشکێنێتو لەگەڵ هەر بەرەو پێشچوونێکدا خۆی نوێ بکاتەوە. پێ ئەچێت نالی لەم سۆنگەیەوە وتەیەکی کردبێتە بنەمای بیرکردنەوەی، کە نەجووڵانو نۆژەن نەبوونەوەو چەق بەستن واتای مردنە. هەر کەسو نەتەوەو کۆمەڵگەیەک ئەو خەسڵەتانەیان تێدابێت، ئەوە بەرەو کەنار ڕێ ئەکەنو لە خانەی دەروونیو جەستەیی بەرتەسک دەربازیان نابێت. گۆرانی بۆ پاڵەوانی نادیاری پێشینەیان ئەڵێنەوە. ئەو پێشینەیە لە هیچ کەلەبەرێکی سروشتیو کۆمەڵایەتیاندا خۆی مەڵاس نەداوەو بوونی نییە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە شێوازێکی سۆسیۆلۆژیانە بە کورتی باس لە توانای تێڕوانینی نالی ئەکەم لە رووی کەسایەتییو داهێنانو زمانەوانیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیەوە. چڕیو پڕی بەرهەمەکانی نالی چەندین لێکۆڵینەوەو باسیتر لە خۆیان ئەگرن. بۆیە لەم تێڕوانینەوە خۆم لە شیکاری وشەکان نەداوە، تاوەکو خوێنەر خۆی لە رووی زمانەوانییەوە ئەو وشە ئارایانە هەڵسەنگێنێت. ئەوەی من مەبەستمە تەنها شرۆڤەی کرۆکی چۆنیەتی ئەو تێروانینانەیە، کە نالی لە ژیانو دەرووبەری سروشتیو مرۆڤایەتی روانیووە. واتە ئەم لێکۆڵینەوەیە تێڕوانینێکە، کە ئەکرێت بەدواچوونو لێکۆڵینەوەی فراوانتری لە بارەوە بکرێت.

من وەک عاشقێکی ئەو مەزنە لە هەوڵو دەستە کوتێدام، تاوەکو چەمکێک لە چامی کەواکەی، یان ریشوەیەکی سەرو مێزەرەکەییم بەردەست بکەوێت. هیچ نەبێت ڕێگا

خۆش بکەم خەڵکانی بە توانا بەو مێژووەدا بچننەوەو چەند ڕاستیەکیتری لێ هەڵبهێنجنو بنەمای زانستی نەتەوەییمان درەوشاوەتر بکەن. خۆی گوتەنی:

**یا توربەتێ ، یا غوربەتێ با ڕێ بشکێنین**

**هەر مونتەظیرە ((نالی)) ئەگەر مرد و ئەگەر ما.** (١٢١:١٤)

تاوەکو بتوانرێت ڕۆشنبیریو شارستانی نەتەوەییمان بێ دژایەتی بێ بنەما بەرەو پێش بچێت. ڕاستەوخۆ لەگەڵ برەوی ڕۆشنبیری سەردەمدا وەک پێویست لێکیان بئاڵێنینو لە بێژنگیان بدەین. کەسانی شارەزاو دڵسۆزی نەتەوەکەمان بتوانن بەرفراوانتر لە چەندین ڕوانگەی بیرکردنەوەی نالی بکۆڵنەوە.

ئیسماعیل فەرەج

## کەسایەتی نالی

لێکۆڵینەوە لە نالی وەک خۆدانە بەر شەپۆلی ئۆقیانوسێکی بێ کۆتایی وایە. دیارە ئەگەر ئاوابێت کارەکە بەو ئاسانیە نییە، کە بتوانین شێوازی کەسایەتیو داهێنانو چالاکییە هزرییەکانی ئەو مەزنەو شێوەی بیرکردنەوەی شرۆڤە بکرێنو گرێوگۆڵی نهێنیەکان بکرێنەوە. خۆی واتەنی:

**((نالی)) عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا**

**مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفظی کەم و بچووک.**(١٤-٢٦٠)

یاخود بە پێی بۆچوونی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە پارچە شیعرێکدا نالی مەزن لە خۆی ئەدوێتو ئەڵێت:

**ناودان قلم نالی فصاحتده همان**

**نشئەی آب بقا، زمزمەء کوثری وار.**(٢١٨,١٤)

ئەمە واتای ئەوەیە، کە بسولکی قەڵەمی نالی لە ڕەوانیدا نەشەی ئاوی حەیاتو بیری هەڵقوڵینی حەوزی کەوسەری هەیە. هەڵقوڵینو لەبەر ڕۆیشتینو بەردەوامی واتای زیندوویەتیو مانەوەیە، واتای ژیانە. ئەو حەوزەی نالی مەبەستێتی ئەو ئۆقیانووسە بێ سنوورەیە، کە پێویستی بە (غواص) هەیە، تاوەکو مرۆڤ بتوانێت تیایدا رۆبچێت. خۆی وتەنی:

**بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕو گەوهەرە، ئەمما**

**غەوواصی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە.**(٤٨٠,١٤)

وەنەبێت نالی ئاگاداری جوگرافیا نەبووبێت، نەخشەیەکی بە ئاگایانەی جیهانی لەبەردەستدا بووە، کە شارەزایانە بە پێی تێڕوانینی خەڵکو ناوچەکە بە کاری

هێناوە، ئەگینا ناوی یەکێک لە ئۆقیانووسەکانی ئەبرد وەک چۆن بۆ ئاسانی تێگەیشتن ئەڵێت:

**سروشکی من کە لێڵاوە ، غوباری کۆە و هاموونە**[1]

**وەرە سەرچاوەکەم بنوارە ، وەک ئاوێنە ، چەند روونە**(١٤:٥٢٠)

ئەگەر مرۆڤێک ئاوا خۆی لە تانوپۆی ژیان بدات سەرسام نابیت؟ چۆن ئەکرێت بە چەند وشەو دێڕێک، یان بە لێکۆڵینەوەیەک کەسایەتی ئەم مەزنەی دنیای رۆشنبیری کوردی پێناسە بکەین‌و دیوە نادیارەکانی ژیانی ئاشکرا بکەین؟

بە هەر حاڵ چەندین ڕێگا هەن، کە ئەگەر بۆ مرۆڤ بشێت لێیانەوە هەوڵ ئەدات، تاوەکو بتوانێت چمکێک لە ژیان‌و هەڵسوکەتی خۆیی‌و کەسانی‌تری پێ شیبکاتەوەو تێیان بگات. جا ئەو ڕێگایانە ئایینی بن، یاخود فەلسەفی‌و زمانەوانی، یان سیاسی، یاخود زانستی‌بن. بێگومان هەر کام لەو ڕێگایانە مێژووی دیاریکراو وە سنووری کارو تێڕوانینی خۆیان هەیە. هەر یەکێکی پێشتریان لەوی پاش خۆی نوێ‌ترە. بەڵام مرۆڤی سەردەم خوازیاری ئەوەیە، کە لە ڕێگەی زانستەوە بتوانرێت داهێنان‌و بژێوی‌و پێویستی دابین‌کردن‌و ئاستی پێکەوە ژیان‌و سەربەستی بۆ خۆی مسۆگەر بکات.

ئەمڕۆ ئێمە لە سەردەمی پێشکەوتنی زانست‌و تەکنەۆلۆژیدا ئەژین. کاریگەریی ئێمە بە سەر ئەو لایەنەوەو ئەو لایەنە بە سەر ئێمەوە بە ئاسانی بەدی ئەکرێت. بەڵام بۆ ئەو سەردەمەی ئەم مەزنە مرۆڤەی کوردی تیادا ژیاوە، بە هەموو ئەو جیاوازیانەی

---

١- کۆە و هاموون ناوی دوو شاخی بەرزن لە تورکمانستان. جگە لەوە لە مامۆستا جەعفەرم بیست، کە دەریاچەیەک لە ئێران لە ناوچەی (سیستان) ناوی هاموونە.

ئێستاو ئەو کاتەشەوە مرۆڤ، جگە لە ئارەزووە بایۆلۆژیەکانی بە رادەیەکی کەمتر مەیلی بۆ بابەتەکانیتر هەبووە. ئەوجا لە پلەی دووەمدا جیاکردنەوەو گرنگییە تایبەتیەکانی خودی مرۆڤ خۆی هێدی هێدی گەشەی کردووە؛ تێڕوانینی لە ئاسمانەوە خستۆتە سەر زەوی. گرنگترینیان گەشەی ئەزموونە کۆمەڵایەتیو مێژووییەکان بووە.(٢٣٥:٣٦) ئەم بابەتە لە توانای درک پێکردنی ئاستەنگو کێشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە بەرجەستە ئەبێت، هەر ئەو شارەزاییو ئەزموونەیە کۆمەڵگە رێک ئەخاتو کرداری بەرەوپێش بردنی مرۆڤو گۆڕانکاری تێدا ئەوروژێنێت.

**نیشانەی پوختەگی بێ دەنگییە ((نالی)) ! ئەگەر پوختەی**

**بە حوججەت طەی بکە نامە ، بە حیددەت پەی بکە خامە.**[٤٧٣,١٤]

لە شیعرەکەدا ئەکرێت هەر شێوە جووڵەو گۆڕانکاریەکی زیندوو، یاخود بونیادنەرانەی راستەقینەی تێدا دەستنیشان بکرێت. ئەم بوارە تانوپۆی زۆری لێ ئەبێتەوە. لەم بەشەدا مەبەست تەنها والا کردنی هەندێک لە خەسڵەتەکانی کەسایەتی نالییە.

نالی وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دیار ئەو درکو شارەزاییو ئەزموونانەی لە خودی خۆیەوە بۆ مرۆڤی سەردەمی خۆی گواستۆتەوەو ئێمە، تاوەکو ئەمڕۆ سوودمەند بووین لێی. ئەو هاوکێشەیەی بە زیندوویەتی راگرتووە، کە لەو باوەڕەدایە هەموو کارو چالاکیەکان لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤنو رادەی گرنگیدان بە مرۆڤ سنووری نەبێت.

گرنگیدان بەم مەزنە مرۆڤەی کورد مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە. لە نێو تەمومژی نامۆییو نادیاری ئەو مێژووەدا دەست بۆ ئاڵۆزترین بابەت ئەبەین، کە ئەویش کەسایەتی خودی نالییە. هەوڵی دڵسۆزانەی بەرچاو هەیە بۆ ئەم مەزنەی دنیای رۆشنبیری کوردی. لە دنیادا هەر وا بووە بیرمەندان، توێژەران لە زۆر بواری مرۆڤایەتیدا پێشئەوەی باسو لێکۆڵینەوە بکەن لە چەندین روانگەی جۆراوجۆر ئەدوێن. بیری جیاوازیشیان لا بەرجەستە ئەبێت. بەو جیاوازیانەشەوە لە زۆر رووەوە جارێکیتر بە هەر شێوازێک بێت پێک گەشتوونەتەوە، بەڵام هیچ کاتێکیش یەک کڵێشەییو یەک دیدی تێڕوانینی هزریان نەبووە. هەر ئەمەشە بیرمەندو توێژەرانی هانداوە تیۆرو یاساو پێگەی جیاوازی بیرکردنەوە بەکاربهێنن‌و باسو لێکۆڵینەوەی جیا لە سەر کێشەیەک، یاخود رەوشێک بنووسنەوە.

نالی لەم روانگەیەوە زۆر وردەکارانە بۆ ئەم سۆنگەیە رۆشتووە. جگە لە واتا رەواڵەتیەکەی شاکارێکی نالی، کە ئەکرێت بە چەندین شێواز لەو لایەنەوە شرۆڤە بکرێت. نالی ئەڵێت:

**سەری هەر مووی بەدەنم طەرزە تەمەننائێکە**

**گەردشی نووکی سەرم دوکەڵی سەودائێکە**

**وەرە سەر سەیری صەفاگاهی نەظەرگەی چاوم**

**کە عەجەب مەنظەرەیی سەیر و تەماشائێکە**(١٤-٤٦١)

لێرەوە هەوڵی دابینکردنی بنەماکانی کارکردن ئەدات بۆ داڕشتنی پلانی خۆشنوودی مرۆڤایەتی. هەر ئەو شێوە هەوڵدانەیە، کە جیاوازیەکان ئەخەنە چوارچێوەیەکی زانستیەوە. بوار بە چەندین بیروبۆچوونو رای جیاوازیتر ئەدەن،

تاوەکو بە یاسا کۆتاییان بێت. مەبەست لە وشەی کۆتایی کۆتاییهاتن نییە، بەڵکو کۆتایی لە لێکۆڵینەوەدا واتەی سەرەتای دەست بەکاربوونە. ئەمە بۆ ئێمە لە باسکردنی نالیی‌یەوە ئاشکرایە، کە چۆن دینامیکیەتێکی زیندووی بە ژیانی خۆی داوە ئەو کۆتایی‌و سەرەتایەی ئاشکرا کردووەو ئەڵێت:

**تابەکەی وەک راوییەو ، وەک سانییەی سێ پەل شکاو**

**بێ طەواف و سەعی و عەمرە هەر بخەوم و ، هەر بخۆم**

**من لەوانەم چی کەوا ئەهلی وەسیلەو مەسئەلەن**

**عامیل و ناچار و مەعذوور ئەر بڵێن هەر بێنە بۆم !** (١٤:٣٠٢-٣٠٣)

هەمان ئەو دەست بەکاربوون‌و بەردەوامیەیە، کە کەسایەتی‌و بیرمەندانی‌تری دنیا گرنگیان پێداوە.

ئەو کاتانەی لایەنە مادی‌و مرۆڤایەتیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هاوسەنگیان تێکئەچێت، یاخود بە پێچەوانەوە لەوپەڕی بووژانەوەدان، لێپرسراویتی لە سەر هەردوو ئەو لایەنە سەرهەڵ ئەدات، چونکە لە سێبەری شەختە بوون‌و تاریکستان‌و تەمومژی لێپرسراوەتیدا، یاخود لە خەوی حەوانەوەو پاڵدانەوەی بێ هەڵوێستیدا، ئەو کەسانەی بەرەو ئامانجێکی چاکسازی‌و رۆشنبیری مادی‌و کۆمەڵایەتی رێچکە گرتوو هەنگاو ئەنێن، هەوڵی تاوتوێی کێشەو گرفتی شارستانی ئەدەن، کە ئەگەر لێپرسراویتیەکە، وەک پێویست لە ئەستۆ نەگیرێت ئەوە بارودۆخە شەختە بووەکان ئەبنە بەربەست بۆ لایەنە گرنگەکانی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیە. تا رادەی دانەڕشتنی پلان‌و دواخستنی بۆ سەردەمێکی‌تر. هەر دوو رەوشەکە بوار بە شێوازو بیری جیاوازی ئەو لایەنانە ئەدات لێی بدوێین.

نالی ئەو شێوە لێپرسراوێتییە شەختە بووانە بەلاوە ئەنێتو هەڵۆ ئاسا لە بەرزی ئاسمانی زانستو داهێنانەوە باڵەفڕێ ئەکات. بۆ گەیشتن بە ئاشکرا کردنی ئەو بابەتە نادیارانەی بوونەتە سەکۆی گفتوگۆی چەندین روانگەی مادیو کۆمەلایەتی بۆ چارەسەری کێشەو دروستکردنی پەیوەندی نێوان تاکەکەسو کۆمەڵگە، یاخود کۆمەڵگەو خێزانو پاشان بۆ سەر ئاستی دەسەلات، لە بواری زانستە هونەریەکاندا.

**لێم حەرامە دانەوو ئاوی حەماماتی حەرەم**

**من کە بازی دیدە بازم نەک شەوارەی دەستەمۆم**"٣٠١:١٤"

یاخود لە شاکارێکیتریدا ئەڵێت:

**بە ظاهیر شادمانیمە لەبەر کەتمی هەموو دەردان**

**کە ((نالی)) گەر بناڵێنێ ئەمیش نەشئە و سورووریکە** "٤٦٠,١٤"

لە چامە پڕ بەها سوێیاویەکەی، کە ناردی بۆ سالمی هاوڕێی ئەو لایەنە هونەرییەی بە چاکی تێدا هەڵهێنجابوو. سالم لە وەلامەکەیدا ئاشکرای توانای ئەو پەیوەندیانە ئەکات، کە نالی بە خۆیو کەسو خێزانو پەیوەندی کۆمەلایەتیو ئێرکۆلۆژیاو مۆرفۆلۆژیاو ژینگەوە وابەستەیکردوون، تاوەکو بە واتاکانی ئەم سەردەمەی ئەمڕۆ ئەگاتە ئاستی وڵاتو دەسەلاتی بەڕێوەبردن.

سالم لە بە شێکی وەلامی نامەکەی نالیدا ئەڵێت:

**بۆ موڵکی شامە نامەیی من ، سویی (نالی) یە**

**هەر حەرفی ئەو لە وەضعی ویلایەت دەدا خەبەر**

**پرسیویە ظاهیرەن لە رەفیقانی یەک جیهەت**

**ئەحوالی ئەهلی شەهر و رەفیقانی سەر بەسەر**

لەو سایەوە ، کە حاکیمی بابان بەدەر کران

نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر(١٩٩:١٤-٢٠٠)

مامۆستا موحەمەد ئەمین هەورامانی بۆ مەولەوی ئەڵێت: ((تێگەیشتن لە مەولەوی مەولەویەکی ئەوێت.)) زۆر راستە، بەڵام ئێمە باس لە نالی ئەکەین ئاخۆ تێگەیشتن لە نالی چەند نالی بوێت؟

توێژەرەوانی بواری کەسێتی زۆر بە وردی لە کرداری پەیوەندیە ئاڵۆزە جۆر بە جۆرەکانی وەک: فێربوونو درک کردنو پاڵنەرە سەرەکیە دەرەکیو لاوەکیەکانی تاکەکەس دوواون. گە یشطوونەتە ئەو باوەڕەی، کە بواری توێژینەوەی کەسایەتی لە سەر کردارێکی سایکۆلۆژی یان کۆمەڵاتی، یاخود جەستەیی دیاریکراو ناوەستێت، بەڵکو لە پەیوەندیەکانی نێوان کردارو رەفتارو چەندین کارلێکی خۆییو بابەتیدا خۆی ئەنوێنێت. هەڵسوکەوتو ئاخاوتنو رەوشتو مامەڵەی مرۆڤ کارێکی ئاڵۆزە بۆ لێکۆڵینەوە. بۆیە لە کاتی لێکۆڵینەوەی ئەم بوارەدا چەندین تێڕوانینی جۆراوجۆرو چەندین بیری جیاواز بەشداریمان ئەکەن؛ ئەمە مانای وایە، تاوەکو ئێستا تیۆرێکی راستو دروست بۆ توێژینەوەی کەسێتی نییە، چونکە هەر کەسو بیرمەندو زانایەک هەوڵ ئەدات لە روانگەی بیری خۆیەوە لە مرۆڤو ژینگەی سروشتیو کۆمەڵایەتیەوە لە دابو نەریتو بەهاو رەوشتو مامەڵەوە پێناسەی کەسێتی بکات. لێرەدا راستە ئەگەر بڵێین پێناسەکانی کەسێتی هێندەی ژمارەی گرنگی پێدەرانی ئەبن. لەبەرئەوەی کەسێتی بە یەکەمین رێکخەری بیرو بۆچوونەکانی تاکەکەس ئەدرێتە قەڵەم. ئەو رێکخستنەش سۆنگەی تواناو شێوازی تێکەڵاو بوونی تاکەکەس لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێکئەهێنێت.

**کلاید کلاکهۆن** کەسێتی بەوە پێناسە ئەکات: "تەواوکاری ئەو نەریتە کردەوەییانەی تاکەکەسە، کە لە ڕێگای گروپو دەستە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانی وەک خێزانو مەکتەبو ...هتد فێری ئەبێتو بە ڕۆڵی دیاریکراوی خۆی هەڵئەستێت. ئەمانە بنەی کەسایەتیەکی دیاریکراوی تیادا دروست ئەکەن." (١٠٤:١٨) لێرەدا کەسایەتی لە ڕێگای ڕەفتارو ڕۆڵ بینینو ئاستی تێگەیشتنو هەڵسەنگاندنی خودوە لە ناو کۆمەڵگەدا دەرئەکەوێت. لەبەرئەوەی کەسێتی بونیادێکی کامڵی پێگەشتووە. لە سەر بنەمای جۆریک لە هەڵوێست وەستاوەو چەندین ئاستی جیاواز لە خۆی ئەگرێت، کە ئەمەش مانای وەلامدانەوەی ئەو بنەماو بنچینە گشتگیرەی، کە کەسێتی مرۆڤ بەرەوڕووی دۆخی جیاوازە ئەکاتەوە. (١٠٦:١٨)

**ئۆگبێرن** کەسێتی بە وابەستە بوونی نەریتە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤ خەملاندووە، ئەو وابەستەییە گشتگیرە لە ڕێگەی هەستو نەستو نەریتو بیرو بۆچوونو تێکەڵاو بوونی ژینگەی کۆمەڵایەتیەوە دەرئەکەوێت. (١٣٦:٢٢) لای **ماکلیلاند** کەسێتی بریتیە لەو بۆچوونەی ئەتوانێت لە کارێکدا ڕەفتاری تاکەکەس پێناسە بکاتو لە هەر ساتە وەختێکیدا بەرەوڕووی دنیای کەسێتی بکاتەوە. (٤٠٩:١٠) هەندێکیتریش کەسێتی تا ڕادەیەک بە خەسڵەتێکی ڕێکوپێکی نموونەیی نەریتو بیروبۆچوونو باوەڕو بەهاو مۆرکی تایبەت بە کەسێکی دیاریکراوەوە پێناسە ئەکەن. هەندێک کەسانیتر کەسایەتی بەوە پێناسە ئەکەن، کە بریتیبێت لە دەرەنجامی هەموو ئەو ئەزموونە کەسییانەی بە هۆی ژینگەی شارستانییەوە بەرەوڕووی دەراوی تێکەڵاو بوونی کۆمەڵایەتی ئەبێتەوە. (٣٣٥:١٣) **ئەڵبۆرت** پێناسەی کەسێتی بەوە ئەکات، کە ڕێکخستنێکی داینامیکیە لە نێو ناخی مرۆڤدا. ئەو ڕێکخراوە سایکۆ ـ فیزیکییەیە، کە

شێوازی ڕەفتاری تاکەکەس دیاری ئەکات بۆ مسۆگەر کردنی هاوسەنگی لەگەڵ ژینگەدا.(٣٥٦:٢) ئەکرێت بەم ڕیزبەندیانەدا بچینە خوارو چەندین پێناسەی جیاوازی کەسێتی بکەین. ئەمە جگە لەوەی هەر کەسێک لە ئێمە ئەتوانێت بە پێی بۆچوونی خۆی بە هەندی کەڵکە بوونی زانین‌و ئەزموونەکانی خۆی پێناسەیەکی تا ڕادەیەک شیاو بۆ کەسێتی دابنێت. بەگشتی کەسێتی لە دوو پێکهاتەی سەرەکی مادی‌و کۆمەڵایەتی یاخود ستوونی‌و ئاسۆیی پێکدێت، لایەنی بۆچوون‌و فێرکردن‌و زانین هەڵی ئەسەنگێنێت‌و دیاری ئەکات. لەم ڕوانگەیەوە ئەکرێت چەند خەسڵەتێکی دیار بۆ کەسایەتی نالی دەستنیشان بکرێن. لەوانە:

**یەکەم:** نالی لە دنیای شیعرو ئەدەبی کوردیدا بێ هاوتایەو یەکێکە لەو زانا پایە بڵندانەی شەتڵی چەندین بواری ڕۆشنبیری، شارستانی، کولتووری، مرۆڤایەتی بە زمانی پاراوی کوردی ڕاستگۆیانە چاندووە. کردوونی بە بەردی بناغە بۆ سەردەمی خۆیی‌و پاش خۆی‌و لە زۆر بواری فەلسەفەو زانست‌و شارستانی دوواوە.

هەوڵەکانی ئەم مەزنە بریتین لە کۆمەڵێک دڵسۆزی‌و بە تەنگەوە هاتنی ڕۆشنبیری‌و شارستانیەت‌و کولتوورو هەڵدان بۆ داڕشتنێکی شێوە زانستیانەی زیندوو.

**دووەم:** نالی نموونەیەکی دەگمەن‌و سامانێکی نەتەوەیی گەورەی وای بۆ بەجێهێشتووین، کە قەڵەم‌و نووسینی چەند لاپەڕەیەک، یان لێکۆڵینەوەیەک نەتوانێت لە تواناکانی ئەم مەزنە بدوێت. هەموو بوارە فەلسەفی‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتیەکانی بە ئاستێکی وادا بردوون، کە بوون بە بنەماو ڕوونمای ئاستی پێشکەوتنی ئەو سەردەمەو گەنجینەیەکی گونجاون بۆ ئێستای ئێمەو ئەکرێت

لەسەریان بدوێین. بۆیە ئەکرێت لە ڕێگای وشەئاراییو هونەرو ئێستاتیکای شیعرەکانیەوە هەڵسوکەوتو چۆنیەتی بیرکردنەوەو کەسایەتی ئەو مرۆڤە مەزنەی کوردی پێ دیاری بکرێت. ئەم بوارانە هاوتان لەگەڵ تواناکانی نالیدا بۆ تێڕوانینی شایستەی ئەو جموجۆڵی هەڵسوکەوتو بیرکردنەوە ئاشکرایەی کەسایەتی خۆیی پێ ناسیووەتەوە. بە ئاشکرا ئەڵێت:

**ڕاستیی جەوهەرییە تیغی زوبانی ((نالی))**

**نەرم و توند ، ئاوی گەلوگیرە ، قصەی پێ دەبڕێ** (٦٥٤:١٤)

**سێیەم:** ئەتوانرێت نالی لە ریزی ئەو کەسایەتیانە ناونووس بکرێت، کە هەوڵی پێشکەوتنو گەشە پێدانی شارستانی مرۆڤایەتیان داوە. وەک خاوەن بیرێکی داهێنەرانەی شایستە باسی بکرێت.

بۆ خوێنەرو توێژەر هەیە ئەو کەسایەتیە مەزنە لە ڕوانگەی پێشکەوتنی شارستانیەوە بە خاوەن بیری پێشکەوتوخوازی ئەو سەردەمەو گەشەو پێشکەوتنی سەردەمێکی دیاریکراوی کۆمەڵگەی ناونووس بکات. بە پێی ڕوانگەو بیرو بۆچوونی جیاواز لە یەکە بە یەکەی بەندە شیعرییەکانی بکۆڵرێتەوە. ئەوجا مەودای گۆڕانکاری ئەو سەردەمەی تیادا دەستنیشان بکرێتو بکرێنە بەردی بناغەی ڕۆشنبیریەکی پێشکەوتوو بۆ ئەمڕۆ.

هەموو شیعرەکانی نالی ئەچنە خانەی هونەرەوە. لە کرۆکی هونەری بە ئاگا هاتنەوەی یاخی بوون نزیکمان ئەکاتەوە. یاخی بوون لە هەموو ئەو ڕەوشو ڕووداوە دزێوە ناوازانەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕووئەدەن. تاوەکو بەو یاخی

بوونە ڕەوتی ژیانی ئاسایی بۆ کۆمەڵگە بگێڕێتەوە. هەر دێڕێک لە شیعرەکانی نالی جوانیەکی بێ هاوتای ئەقڵەو بە زانستو فەلسەفە پێودانگ ئەکرێت.

**ئەحوەلی تەفرەقە نەظەر تەقوییەتی سەبەب دەکا**

**عاریفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا.**(٩٧:١٤)

کەواتە لە خۆیەوە نییە، کە ئەڵێت:

**((نالی)) ئێستە تاجی شاهیی و تەختی خاقانیی هەیە**

**شەوکەت ئارا ، موحتەشەم دیوانە، فیکرەت صائیبە.**(٤٠٠:١٤)

زۆربەی ئەو وشانەی بەکاری هێناون، بەندن بە سۆسیۆلۆژیاو ئێرکۆلۆژیاوە. واتاو گەورەیی مرۆڤمان بۆ شرۆڤە ئەکەن. لێرەوە گەورەیی کەسایەتی نالی خۆی نیشان ئەدات، کە لەو سەردەمەدا کەس، وەک نالی بەو شێوازی هەوڵو خۆێندنەوەیەدا تێنەپەڕیووە. پەی بە گرنگی ئەو ڕاستیانە نەبردووە. بۆیە بەرهەمەکانی ئەم مەزنە بێ منەتن بۆ هاتنو بە دواچوونی جۆراو جۆری هونەریو ئەدەبیو زانستیانە.

نالی لە داڕشتنی پلانو نەخشەو بۆچوونی ئاسودەیی بۆ پێشکەوتنو گەورەیی کۆمەڵگەکەی خۆی مێژووی تۆمار کردووە. بگرە ڕۆشنبیری نەتەوەو وڵاتیشی بە نەمری هێشتۆتەوە. لە داڕوتانو چەق بەستن ڕزگاری کردوون، چونکە ئەم مەزنە عاشقی وڵات بووە. هەر لەو عەشقەیەوە بۆ وڵاتەکەیەتی، کە ئەڵێت:

**دڵ سیاسەنگ نەبێ ، مائیلی خاکی وەطەنە**

**خاڵی لەعلی حەبەشە ، ساکینی بوردی یەمەنە**(٥٢٤:١٤)

مانای وایە، کە نالی هەموو شتێکی لە وڵاتەکەیدا خۆشویستووە. خۆ ئەگەر خۆشەویستی بچێتە ناو دڵەوە ئەوە جێگەی ڕقو کینەی تێدا نابێتەوە. خۆ ئەگەر

کرۆکی خۆشەویستی خودو وڵاتو نەتەوەش لەو شێوە خۆشەویتییەوە دیاری بکرێت، ئەوە هەموو ئەو ئەستێرانەی لە هەر وڵاتێکی‌تری ئەم جیهانەدان کەسانی بە تواناو برەودەری گۆڕانکاریە بنچینەییەکانن دێنە ریزی نالی‌و دەرئەکەون.

توێژینەوەو شرۆڤە کردنو گواستنەوەی رووی چەندایەتی بابەتەکانی نالی بۆ باری دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌و پۆلێن کردنیان کۆمەڵێک کڵێشەی چۆنایەتی بیرکردنەوەی خودی ئەم مەزنەمان بۆ روون ئەکاتەوە. لە هەمان کاتدا چۆنیەتی خەسڵەتی ئەو کردارو رەفتارو دڵسۆزی ئەم کەسایەتیەمان بۆ دەرئەخات.

**فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە**

**((نالی)) ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە ، دیوانی هەیە !** (٥٧٧،١٤)

**چوارەم:** نالی شاعیرێکی پایە بەرزو بێ هاوتای دنیای شیعری کوردیە. هەر لە سەدەمی خۆیەوە، تاوەکو ئێستا پلەو پایەی ئەو مرۆڤە وەک ئەستێرەیەکی درەوشاوە بە ئاسمانی دنیای رۆشنبیری کوردیەوە دیارە. زۆربەی هۆنراوەکانی لە ئاستی رونبیری‌و زانیاریەکی وادان تێڕوانینێکی تایبەتی بۆ تێگەیشتن دەوێت. کەم کەس هەیە بتوانێت بە یەک جار مەبەستو خواستی نالی لە بۆچوونێکدا شیبکاتەوە، وەک ئەوەی، کە خۆی مەبەستی بێت تێی بگات، هەر وەک نالی خۆی ئاماژەی پێداوەو ئەڵێت:

**((نالی)) بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر**

**بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە صەد داوی نایەوە**(٥٥٥:١٤)

ئەوەندە بە وردی چۆتە نێو دنیای ماریفەتەوە، کە ئەتباتە ناو دنیایەکی دەروونیو فەلسەفی ئەوتۆوە لە گرێوگۆلی ژیانی تاکڕەوی دەرباز ئەبیت. بە ناچاری لەگەڵ گشتدا یەک ئەگرێتەوە. نالی خۆی زۆر بە ئاشکرا ئاماژەی بەم لایەنە داوە ئەڵێت:

**من سەروی ڕەوانی چەمەنی عالەمی بالآم**

**((نالی)) بە طوفەیلی بووەتە سایە لە دوو من.**(٣٣٢:١٤)

یاخود لەم شاکارەدا، کە خۆی لە لوتکەدا ئەسەپێنێت:

**ئیثباتی خەط و خاڵە ، بەصەد شوشتن و گریان**

**ناچێتەوە ئەم نوقطە لە نێو دیدەیی تەڕدا.**(٨١:١٤)

لە ڕواڵەتی واتای شیعرەکانی نالی ئاشکرایە، کە لە خەسڵەتی بە ئاگاییو پێگەیشتنی خودی کەسایەتی پێوە دیارە، جگە لەوەی گوزارەی کرۆکی وشەکان ئەمانبەنە نێو دنیایەکی ئاڵو والآی فەلسەفەو زانستەکانیترەوە. پەلکێشی جۆرە ڕۆشنبیرییەکمان ئەکات، کە هەوڵی پێگەیشتنو گۆڕاناری پۆزەتیڤی کەسێتی تێدا بدرێت.

لەو سەردەمەوە، تاوەکو ئێستا شیعرەکانی نالی پڕن لە حیکمەتو پێکانی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی. سیستەمی باوی ئەو سەردەمەی کردۆتە وانەی بە سوود. بۆ ئەمڕۆش ئاشکرایە، کە لەوانەیە ببنە هەوڵدانێک بۆ سازاندن بە بەلاوەنانو ڕاستکردنەوەی ناجۆرییەکان. ئەتوانرێت پشووی جەستەییو ئارامی بۆ بیر بەرجەستە بکەن. ئەویش لە ئەنجامی ئاوێتە بوونی ئەو توانا فیسیۆلۆژیو هۆکارە ژینگەییو ڕۆشنبیریو زانیاریە تایبەتیانەوەیە، کە خودی نالی خۆی بە دەستی هێناونو کردوونی بە داهێنان لە شیعرەکانیداو بە لای خۆیاندا ئێمە ڕاپێچ ئەکەن.

ئەم سۆنگەیە تێڕوانینێکی جوان بە کەسایەتی نالی ئەبەخشێت. ئەو خەسڵەتانەیە توانیوییەتی ناخی کەسایەتی تایبەتی نالی بهەژێنێتو کاری تێبکات. بتوانێت ئەو کاریگەری ئەو شێوە تێڕوانینەی خۆی بۆ دەرەوەی خود بگوێزێتەوە، وەک ئەو نامەیەی بۆ مردنی باوکی حەبیبەی نووسیووە. ئەمیش (نالی)، کە وەک حەبیبە ئەگری. بەڵام گەورەیی نالی خۆیی لە گەوهەر رشتندا ئاماژە پێداوە.

**بۆ گریەیی تۆ ڕەنگە منیش هێندە بگرییم**

**گەوهەر بڕژێنین بە بوڵندیی قەد و باڵات.**(١٣٩:١٤)

یاخود بەو شاکارە پەنە ئاسایەی، کە بەردەوام مەبەستێتی کەسایەتی خودی کۆمەڵایەتی پێگەیشتوو لە خۆیەوە بدات بە کەسانی تر

**کە خاکی، خاکی دامەن بە، وە گەر نە، تۆزی بەر بادی**

**کە ئاوی، ئاوی گەوهەر بە، وە گەر نە، بڵقی سەر ئاوی**(١٤:٦٨٣)

یان ئەو کاتەی وەڵامی نامەکەی برایم پاشای میسر ئەداتەوە:

**میرود نالی أز أینجا چو حریص أز دنیا**

**با لب خشک و کف خالی و چشم پر نم.**(٣١٣:١٤)

هەر چەندە ئەم نامەیە بە نەبوونی پێکهاتەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی کوردەواریماندا شۆڕ ئەکاتەوە. (بە پێچەوانەی سەردەمی عەباسیەکانەوە، کە تاوەکو کام ئاست موتەنەبییان بە لاوە گرنگ بووە. بە تایبەتی دوای ئەوەی لە دەسەلاتی عەباسیەکان زویر ئەبێتو داوەتی شام ئەکرێت، تاوەکو پارێزگاری گرنگیەکەی بکرێت). ڕێکخستنو گرینگیدان بە فاکتەرەکانی ژیانی کەسایەتی نالی ئاشکرایە، کە تا چ ڕادەیەک توانیویەتی هاوسەنگیو هێزو دینامیکیەتی کەسایەتی

خۆی بپارێزێت. واتە هەستو سۆزو خۆشەویستی تەواوی ئەم کەسایەتیەمان پێ ئەناسێنێت.

**وەرە سەیری خیابان و بەیاضی دەفتەری نالی**

**کە صف صەف ، مەصرەعی بەرجەستە ، ڕیزی سەروی مەوزوونە**[٥٢٣:١٤]

پێویستە وا لە کەسایەتی ئەم مرۆڤە مەزنەی کورد وردبینەوە، کە ئەو سەردەمەو تەنانەت پێش خۆیشی لەو مێژووەدا. لەو بستە قەڵەمڕەوەی خاکی کورداندا. نالی یەکێک بووە لەو کەسایەتیە دیارانەی سروشتی مرۆڤایەتی هەڵسەنگاندووە. ئازایانە بەرەنگاریی گێچەڵەکان بۆتەوەو بیری خۆی لە سەر داڕشتوون، چونکە وشەیەکی بێ مەبەست لە شیعرەکانیدا بەدی ناکرێت. ڕستەیەک نییە بە واژە کۆمەڵایەتیو دەروونیەکان لە بابەتێکی فەلسەفەی ژیانی ڕاستەقینە نەدوێن. چەندین بابەتی ئاڵۆزی لە کرۆکی مرۆڤەوە والا کردووە.

تاوەکو ئەم سەردەمە کەسێکی ئاوا بوێرو خاوەن بیرێکی کراوەو خولیای پێشکەوتنو داهێنانو دەسگیری نەتەوەکەمان بە شێوە زمانێک پێشتر پەی پێ نەبرابێت، شک نابەین. کەس بەو ئازایەتیە خۆی لەو بابەتانە نەداوە. ئەگەر ئەو نەبووایە خۆ، تاوەکو ئێستا لەوانەبوو تورکیو عەرەبیو فارسی ببوونایە بە شێوازی نووسینەکانمان. ئەگینا بۆچی ئەوە چەندین ساڵە ملیۆنان خەڵک داوای یەک شێوە نووسینی زمانی کوردی ئەکەن؟ نالی لە دڵسۆزی بۆ خاکو نەتەوەکەی ئەو داهێنانە گەورەیەی بەرجەستە کرد.

**کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کردییە**

**هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا**[١٠٧:١٤]

ئەو هەموو هەڵوێستو زانیاریە زمانەوانیو خۆشەویستیو وڵاتو ئاینو خۆشنودیو خەمۆکیو بێ ئومێدیو تێڕامانو عەشقو گەشەو گۆڕانو نۆژەن بوونەوە مادیو کۆمەڵایەتیەی سروشتو مرۆڤ، کە لای نالی بە بێ زۆر لە خۆ کردن لە رووی بیری خۆیەوە هێناونیەتە کایەوەو کردوونی بە پێگەی بزووتنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی.

تاوەکو لەم مەزنە رامێنی لکو پۆی جیا جیاو تەرزی نوێمان لا بەرجەستە ئەبێت:

**بەحثی سیرِری دەهەنی نوقطە بە نوقطە بگەڕێ**

**سەری مووێ نییە بێ نوکتە لە دیوانمدا**(٩٢:١٤)

ئەم تانوپۆ چڕو پڕو زانیاریانە هەندێک جار جیاو هەندێک جار ئاوێتە بە یەک دەبن. وا لە مرۆڤ دەکەن لە بەرزیی کەسێتی ئەم مەزنەوە بکەوێتە هەڵشیلان، تاوەکو ئاشنایەتیەکی نوێ بهێنێتە کایەوە. بەڵام هەر ئەوەندەیە دوایین جار ئاوێزانی مرۆڤو ژیانە پڕ واتاکەی ئەبێتو بیرو رای سەربەستو مەبەستداری پێشانو ئێستای وەک پێداویستیەکی گرنگ نیشان ئەدات، دوا وۆژێکیتر ئەبینیت. ئەبێتە بناغەو شێوازێکی شایستەی رەنگاوڕەنگی رۆشنبیریو شارستانیو کولتوور، کە وەک پێویست بۆ دەوڵەمەند بوونی بیرو گەشەی بونیادی نەتەوەکەمان بەردەوام لە سەری بدوێینو لێبکۆڵینەوەو هەر جارەی ئاشنابوونێکیتر لە فەرهەنگی نەتەوەکەماندا بەرجەستە ببێتو بابەتی نوێی لێ هەڵبهێنجرێت. لەم رووەوە نالی لە ترۆپکی شیعرو تێڕوانینو بیروبۆچووندا بۆتە هەوێنی پێگەیاندنی چەندین کەسایەتیو شاعیر، کە خۆی بە سەریانەوە وەستاوە. ئەمە وەک تێڕوانینێکی هەرمی وایە، کە تاوەکو رادەیەک لە تێڕوانینی پێشتر نزیکە. بەڵام ئەمەیان لە

سەرەوە دەست پێئەکات بۆ خوارەوە. واتە نالی لە ترۆپکی بابەتەکاندا وەستاوە. هەر پیاداهەڵگەڕانێک بۆ سەرکەوتن لایەنی ڕێکخستنی کەسایەتیەکەیی زیاتر تیادا دەرئەکەویت، کە تاوەکو چ ڕادەیەک هەوڵی ڕێکخستنی ئامانجەکانی ئەداتو گرنگی بە ڕوونکردنەوەو خۆناساندنی شایستەی خۆی ئەدات.

**((نالی)) مەثەلی حاڵی لە ئەشکەنجەییی غەمدا**

**وەک ناڵە لە نەیدا ، وەکو نالە لە قەڵەمدا**(١٤:٩٥)

خۆ گونجاندن لەگەڵ ژیانی مرۆڤایەتیدا واتای تێگەیشتنێتی؛ تێگەیشتنێکی بابەتیانە بۆ مەبەستی قبوول کردنو زاڵ بوون بە سەر گرفتو ئاستەنگەکاندا. ئاشکرا کردنی شێوازی پەیوەندی کردن ڕێگایەکی گونجاوە بۆ پێشکەوتنی مادیو کۆمەڵایەتی شارستانیەتو گەیاندنی ئەو شارستانیەتە بە دەوروبەر. ئەم خۆ گونجاندنەیە بنەمای پێشکەوتنی تواناو دەسەڵاتی هزر دیاری ئەکات. ب

ەرهەمەکانی نالی لە ژینگەیەکی سروشتیو کۆمەڵایەتی ئەو شێوازە گونجاوەوە هەڵقوڵاوون. ئەم شێوە تێڕوانینە ئەکرێت وەک میکانیزمی خۆ گونجاندنی کەسایەتی نالی لێیبڕوانرێت بۆ دەستنیشان کردنی توانای بەرەوپێشچوونو سەرکەوتنو بەردەوام بوون. لێرەدا ئەکرێت کەسێتی نالی لە ئاستی گونجاندنو سازاندنەوە سەیر بکرێت، کە تا چ ڕادەیەک بە دەستی هێناوە.

**قەللابی جیهان نەقدی عەیاری نییە قوربان !**

**((نالی)) مەحەکی هیمەتی کردوویە موجەڕڕەب**(١٤:١٣٦)

سەرچاوەو فاکتەری گۆڕانکاری زۆرن بۆ بەرەوپێش بردنو پێگەیاندنی کەسایەتی. هەر کەسێک لە شوێنی خۆیەوە دەتوانێت تۆوی بونیادنانو گۆڕانکاری بچێنێت.

بەڵام وەڵامدانەوەی ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە گەشە پیدەرو ڕێکخەرن بۆ جیاکردنەوەو پێکەوە بەستنیان.[٦٥:٢٨] تێڕوانینێکی لەم شێوەیە بۆ کەسایەتی نالی ئەو خسڵەتە تایبەتیانە جیا ئەکاتەوەو کەسایەتییەکی دیاری لە نێو کۆمەڵگەدا پێ ئەبەخشێت. گرنگی ئەو جۆرە کەسایەتیە بە پێی ڕادەی دەرکەوتنی جیاوازی تواناکانی دەرئەکەوێت. لەم لایەنەوە نالی خۆی درکی بەو توانایەی خۆی کردووەو ئەیەوێت بە خەڵکیش بڵێت من دڵنیام، کە:

**((نالی)) یەک و ئەو کەس ، کە تامی غەزەلی بیست**

**مەعلومی بووە زۆر و کەمی خاریقی عادات.**[١٤٤:١٤]

یاخود ئەڵێت:

**((نالی)) کە غولامی مەدەدی زولف و برۆیە**

**شاهێکە لە بن سایەیی باڵی دوو هومادا** [٨٦:١٤]

ئەم پۆلێنەی سەرەوە لەگەڵ چەندین زانستیتردا ئاوێتە ئەبنو هەموو پێکەوە یەک ئەگرنەوەو ئاستی پێشکەوتنو گەورەیی کەسایەتی نالی لە نێو کۆمەڵگەدا زیاتر دەر ئەخەن. ئەم تێڕوانینە هەرچەندە لە دیدی فرۆیدەوە نزیکە بەوەی، کە فرۆید سێ لایەنی بۆ کەسایەتی دیاری کردووە، ئەوانیش (ئەو، من، منی باڵا)ن، کە (**ئەو**) لێرەدا بریتیە لە یەکەی وێرانکاری، لە هەمان کاتیشدا بونیادنەرە. (**منی باڵا**) ڕەوشتو بەها کۆمەڵایەتیەکان لە خۆ ئەگرێت. (**من**) ڕاڕاو هاوسەنگی (ئەو لەگەڵ منی باڵادا ئەپارێزێت). فرۆید لە ڕێگای (**هەستو نەستو پێش هەستەوە**) ئەم دۆخانە ڕێک ئەخات. ئەمە دیدیکی جیاوازە لەو بۆچوونەی ئێمە مەبەستانە. چونکە کەسایەتی ئاماژەیەکی ئاشکرایە بە خودی مرۆڤ. خودی مرۆڤ بنەمایەکی سەرەکیە بۆ

پێگەیاندنی مانای راستەقینەی **(من)**. **(خود و من)** پێکەوە هاوکاری پێگەیاندنی رەوتی دەروونی مرۆڤ ئەکەن‌و جۆری کەسێتی دەستنیشان ئەکەن. بەپێی جیاوازی سەردەم‌و تەمەنی مرۆڤ **(منی کۆمەلایەتی)** تێدا پێئەگات‌و شێوازی کەسایەتی تێدا دەرئەوێت:

**نوصحی ((نالی)) رەنگە هەر کەس ببیێ ، بیکاتە گوێ،**

**چونکە نەظمی صاف و وردە ، هەر وەکوو مروارییە** (١٤: ٥٨٢)

### ٢. رۆشنبیری لای نالی

باسکردن له رۆشنبیری پەلکێشی زۆر بابەتی مێژووی پێشکەوتنی مادیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەمان ئەکات[٢] نموونەی پیشاندانی ئەو لایەنانە لە شیعرەکانی نالیدا زۆرن. ئەو راستەوخۆ وابەستەی لایەنی رۆشنبیری، شارستانی، کولتووری کۆمەڵگەو پێگە جوگرافیەکەی بووە. باسکردن لە رۆشنبیری، شارستانی، کولتوور، سەنگی مەحەکی شرۆڤەی پێودانگی ژیانی کۆمەڵگە ئەخاتە روو، ئیتر ئەگەر ئەو کۆمەڵگەیە سەرەتایی بێت، یان دواکەوتوو، یاخود پێشکەوتوو بێت.

رۆشنبیری، شارستانی مرۆڤ خۆی دروستی کردوون. هەر خۆیشی ئەتوانێت پێشیان بخاتو هەوڵی گۆڕانکاریان تیادا بدات، یان رایانگرێت، یاخود رەخنەیان ئاراستە بکات.

تاوەکو ئەمڕۆ پێناسەیەکی گشگیر بۆ ئەم دیاردەیە نییە، کە بتوانێت سروشتی سەرچاوەی پێکهاتەکانی ئاشکرا بکات. بۆیە هەر کەسو بیرمەندێک بە پێی ئامانجو شێوازی بەدواچوونی خۆی رۆشنبیریو شارستانیو کولتوور جیا ئەکاتەوەو پێناسەیان ئەکاتو لێیان ئەکۆڵێتەوە.

---

٢- هەر لەو کاتەوەی مرۆڤ لە رێگەی بوونی دەستەکانیەوە، کەوتۆتە رەوتی دژایەتیو لەگەڵ سروشتدا بۆ زاڵبوونو خۆگونجاندن جەنگاوە. هەر لەو سەردەمەوە پێویستی بە شیعر هەبووە تاکو ئاواز بە دەنگی دەربکاتو گۆرانی بچڕێت، بۆ ئەم سەردەمەش هەمان حاڵە بە شێوازێکیتر، چونکە مرۆڤ بەردەوام سەرقاڵی کارو پیشەو هەوڵەو رەنج ئەدات، دیارە ئەمانە مرۆڤ شەکەت ئەکەن، کە ئەگەر بە رەواڵەتیش بێت پێویستی بە جۆرێک حەوانەوەو پشوودان ئەبێت، بۆ ئەوەی بیرو هۆشو جەستەو بیرو وزەی نوێی تیادا ببوژێنێتەوە. ئەوەی پەنای رێزو دڵسۆزی مرۆڤ بێت بێ کاسەلێسیو بێ زۆر لە خۆکردن، ئەوە هونەرە جوانەکانی وەک شیعرو گۆرانی راستەقینەیە، کە خزمەتی ویژدان بکات. ئەم لایەنە پێویستیەکی گرنگە بۆ ئازاد بوون بۆ وەبەرهێنانەوەی هەناسەی ئاسودەیی تا وزەو تواناکان لە رۆتین رزگاریان بێت. هەر هیچ نەبێت ورەیەکی مویزیکی لە دوتوێ ویژدانی مرۆڤایەتیەوە بپشکوێنێ.

تێڕوانینی ئێمەش، تاوەکو ئەمڕۆ لە سەر ئەم سێ لایەنە جیاوازە. بۆ نموونە هەندێک نالی لە بواری وشە ئارایی‌و جوانناسی‌و هونەری ڕەوان بێژییەوە سەیر ئەکەن. هەندێکی‌تر لە رووی فەلسەفی‌و ئایینیەوە. هەندێک لە رووی زانستەو هەندێکیش هەن هەمووی پێکەوە ئەبەستنەوەو پێودانگی ئاستی روونبیری نالی‌ی پێ ئەکەن. هەر روویەکیان هەڵبژێرین‌و باسیان بکەین ئەوە لە ناوەڕۆکدا تایبەتمەندی رۆشنبیری گشتی کۆمەڵگە خۆیمان بۆ ئاشکرا ئەکات. ئەم تایبەتمەدێتیانە لە سۆسیۆلۆژیادا بە پێکهاتەکانی رۆشنبیری، یاخود شارستانی، یان کولتوور ناوزەد کراوە. ئەکرێت بۆ زیاتر ئاشنا بوون کورتە ئاماژەیەکیان پێ بدەم.

**رۆشنبیری** لە کەفـو کوڵی بیروبۆچوونی ناوەوەی خودی مرۆڤەوە دروست ئەبێت. لەبەرئەوەی پێوستی پێیانە، نەک بۆ مەبەستی بەرژەوەندی. رۆشنبیری شۆڕەندی ئەو بەها باوانەی ناو کۆمەڵگەیە، کە خۆیان پێودانگی خۆیانی پێ ئەکەن. لە بەرئەوە پێودانگی پێهاتەکانی رۆشنبیری ئاڵۆزن. بە پێی بۆچوونی زۆربەمان رۆشنبیری خۆی لە بازنەی بەهاو نەریتەو باوەڕو رەوشتەو زانستەو هونەرو ئاستی زانستی کەسی‌و ...هتد ئەبینێتەوە. خەسڵەتی دەستاودەست کردن‌و گواستنەوەو سنوور بەزاندیان تێدایە، کە مەرجی تێگەیشتن لە ترۆپکیدا وەستاوە. ئەمە لە وابەستەیی بیرو توانای بیرکردنەوەی شیاوو ئەزموونی مرۆڤایەتیەوە کەڵەکە بووە.

**شارستانی** لایەنە مادیەکانی رۆشنبیریە، واتە ئەو گوزارشتانەیە، کە لە بیروبۆچوون‌و بیری مرۆڤدا بەرجەستە بوون، گوزارشی مرۆڤە لە بوون‌و کۆمەڵگە. بۆیە خۆی لەو شتانەدا ئەبینێتەوە، کە پێدوایستی دابین ئەکەن، وەک: خواردن‌و کەرەسەو پۆشاکو ماڵو خانوبەرەو هەموو ئەو شتانەی لە بەکارهێنان، یاخود

بەرهەمداری، یان خزمەتگوزاریدا بوونی مادیان هەیەو هەن. هەردوو لایەنەکە لە چەند بەشێک پێکدێن، پێکهاتەی هەر بەشێکیان بەوەی تریانەوە بەندەو لە هەمان کاتیشدا سەربەخۆیی خۆیانیان پاراستووە [(٢٩:٣٠٥)]. لە هەر بەشێکیاندا سێ یەکەی بچووکی کارای تێدا بەشدارە: **یەکەمیان لایەنی درککردنە**. ئەم لایەنە لە زانستی ئاسایی مرۆڤەوە تاکو ئاستی پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکان هەڵئەکشێت. بۆئەوەی بتوانێت ئەو هزری درککردنەکە لە بەرهەم هێنانو بەکارهێنانو خستنەڕووی راستیە مادیو کۆمەڵایەتیەکاندا ئاشکرا بکات. **دوومیان یەکە مادیەکانە**. رایەڵەی ئەم یەکانە هەموو ئەو ئامێرو ئامرازو کەرەسە مادیانەی داهێنراونو دائەهێنرێنو بەکاردێن ئەگرێتەوە، کە بەشداری کارا لە ئاڵوگۆڕو گۆڕانکاری بیرو زانستو تێگەیشتنی نێوان مرۆڤو ژینگەکەیدا ئەکەن. **سێیەمیان یەکە پێودانگییەکانە**. هەموو ئەو پێودانگو بنەمایانە ئەگرنەوە، کە هەڵسوکەوتو مامەڵەی راست، هەڵە، سزا، پاداشت، گرنگیدان، بە تەنگەوەهاتن، ئاستی تێگەیشتنو ...هتد رێکئەخاتو پێودانگی پلەی پێشکەوتن، یاخود دواکەوتەیی بە پێی سەردەمەکە دیاری ئەکات [(٢٥:٨٩)].

ئەم لایەنە بە ئاسانی لە شیعرەکانی نالیدا ئەتوانرێت رەچاو بکرێت. نالی توانیویەتی بنەماکانی رۆشنبیری بە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤەوە وابەستە بکات. ئەم بوارەیە، کە شێوازی یاساو رێکخستنو پێداویستی گرنگی سیستەمی نووسینو پەیوەندیەکانی لای نالی پێکهێناوە. ئەمانە ئەچنە خانەی رۆشنبیریو شارستانیەوە. ئاماژەی ئاستی پێشکەوتنی مادیو کۆمەڵایەتی یاخود دەرخستنی پلەی گرنگیدانە بە رەواڵەتو ناوەڕۆکی ئەو بوارانە پێکەوە.

زۆر نموونەی ئەو جیاکاریو یەکە کارایانە لە شیعرەکانی نالیدا هەن. بۆ نموونە لە **٢٣** بەیتی باسی حوجرە شەقوشڕەکەیدا درککردنی مادیو پێوەندگو رۆشنبیری باوو پلەی پێشکەوتنی رۆشنبیریو شارستانی خسۆتە روو، کە لە سەرەتادا ئەڵێت:

**وەک قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کەوا گرتومیە ناو**

**تارو پۆیی عەنکەبوتە ، زۆرە لێی کردومە داو.**(٣٥٥:١٤)

لەو سەردەمەدا لە دێرەکانی ئەورووپادا، کە بە جوانترین شێوازی ئەندازیاری دروست ئەکرانو بنەی رۆشنبیریو شارستانیان تیادا ئاڵوگۆڕ ئەکرا. بە بەهاترین بابەتی هونەری بە ناویاندا پەرش ئەکرایەوە. بە پێچەوانەی کوردستانەکەی ئێمەوە، کە لە بن بەردو نێو ژووری رووخاودا زاناو دانا پێئەگەیین.

زانای ئینگلیز **تایلۆر** زاراوەی رۆشنبیری، شارستانی لە کتێبی (رۆشنبیری، شارستانی، سەرەتایی) لە ساڵی **١٨٧١**دا بەکارهێناوە. ئەڵێت: ((رۆشنبیری، شارستانیەت، ئەو یەکە گرژو ئاڵۆسکاوەیە، کە هەموو تەرزەکانی زانستو باوەڕو رەوشتو فەلسەفەو هونەر لە خۆی ئەگرێتو مرۆڤ، وەک ئەندامێک لە نێو کۆمەڵگەکەی خۆیدا هەموو توانا بەدەست هێنراوەکانی لەگەڵدا تێکەڵاو ئەکات))(٤٥:٢٤).

بەو واتایە بێت ئەم لایەنە کار لە رێکخستنی زۆربەی ئەو دیاردانەدا ئەکات، کە دوورو نزیک وابەستەییان بە مرۆڤەوە هەبێت. جگە لەو پێناسەیە ئاماژەیەکی کورت بە چەند پێناسەیەکیتری رۆشنبیری ـ شارستانی هەندێ لایەنمان بۆ روون ئەکاتەوە. بەوەی، کە رۆشنبیری بریتیە لە کۆی ئەو شێوازو رەفتارە بە دەست هێنراوانەی زۆربەی زۆری کۆمەڵگە بە لایانەوە پەسەندە. ئەم پێناسەیە هەموو

شێوازە بە دەست هێنراوەکانی ڕەفتاری مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا ئەگرێتە خۆی‌و خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتیان پێ ئەبەخشێت.

هەندێک کەسانی‌تر پێیان وایە ڕۆشنبیری هەموو شێوازەکانی ڕەفتارو بیرکردنەوە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکان پێکەوە ئەگرێتە خۆی. لەبەرئەوە هەر بنەیەکی مادی، کە مرۆڤ دروستی کردبێت چمکێکی ڕۆشنبیری تیادا بەشدارەو خۆی، وەک شارستانی پێناسە ئەکات، واتە هەموو لایەنە مادی‌و مرۆڤایەتیەکانی کۆمەڵگە ئەگرێتە خۆی. بەو واتایەی لە سیستەمی کۆمەڵایەتی‌و دارشتنی زمان‌و ئابووری‌و خێزان‌و سیاسەت‌و ئایین‌و ئاکارو سیستەمی خزمایەتی‌و نەریت‌و هونەرو تەکنەلۆژی‌و بەها گشتیەکاندا بەشداری ئەکات.(١١٢:١) ئەو ڕەفتارانە بە شێوازی تایبەتی لە خۆیدا کۆئەکاتەوە ئەیانلکێنێت بە دنیای بیرکردنەوەوە، یاخود بەو ئیدیاڵەوەی، کە کۆمەڵگە باوەڕی پێیەتی.(١٢٠:١١) ئەم بنەمایانە لە واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ناتوانرێت ڕاستەوخۆ، یاخود سەربەخۆ بەدی بکرێن، بەڵکو هەموویان لە بارێکی ئاوێتەو ئاوێزانی یەکتردان‌و بە جۆرێک لێک ئاڵاون، کە زۆر کرۆڵە(زەحمەتە) بتوانرێت جیاوازیە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکانیان دەستنیشان بکەین. ئەمەش بە ئاشکرا گرنگی توانای زمان ئاشکرا ئەکات، کە چۆن ئەتوانێت تانوپۆی ئەو بابەتانە لە ئاستێکی ڕۆشنبیری بەرزدا بنەخشێنێت‌و هەموویان لە لایەنە کۆمەڵایەتیەکەدا شیبکاتەوە.

تێڕوانین لە توانای نالی لەو چامەدا، کە لە شامەوە بۆ سالمی هاوڕێی بەرێ کردبوو دیارە، کە چۆن گشت بابەتەکانی بە جیا باسکردووەو لە کۆتایشدا هەموویانی پێکەوە بەستۆتەوە. خوێنەر ئەتوانێت تەواوی چامەکە لە دیوانی نالی‌دا

بخوێنێتەوە، لەو شاکارە سوێیاویەدا لە بنەی دروستبوونی مرۆڤەوە لە (ئاوو هەواو گڵ) پەیوەندی هەموو ئاسەوارە مادیو کۆمەڵایەتیەکانی بە رۆشنبیریو شارستایەتی ئەو سەردەمەوە، تاوەکو کۆتایی (نەفخی سوور) ئاماژە پێداوون:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور**

**ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور.**[(١٤:١٧٤-١٩٧)]

ئەو کاتەی کۆرپە لە دایک ئەبێت، وەک مرۆڤێک پێویستی بە چەندین فاکتەری مادیو کۆمەڵایەتی ئەبێت، تاوەکو گەشەو پێگەیاندن لە رووی خواردن، خواردنەوە، دەستگیری، بەرێدا رۆیشتنو قسە کردنی تیادا پێئەگات. بە شێوازو چۆنیەتی کارو کردەوە کۆمەڵایەتیەکان ئاشنا ئەبێتو ئەکەوێتە نێو ژیانی کۆمەڵایەتیو بەرەو رووی لێپرسراوەتی مێژوویی ئەبێتەوە. زۆر پێناسەی جیاواز بۆ لێکدانەوەی ئەو لێپرسراویتیەی رۆشنبیری، شارستانی هەن. لەوانە پێناسەکەی **(کلایدکلاهۆن)** ئەڵێت: رۆشنبیری، شارستانیەت ئەو نموونانەیە، کە بە شێوەیەکی دیارو بەردەوام لە سەردەمێکی مێژووییدا لە هەر دوو بواری دیارو نادیارەوە لە لایەنی بیرو هەستەوە گەشەی کردووە. ئەم رەوشە لە هەموو کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیدا هەیە.جگە لەوەی، کە رۆشنبیری ئاماژەیەکە بۆ رێنمایی پێودانگی رەفتاری ئەندامانی کۆمەڵگە[(١٠:٧٩)]. **مالینۆفسکی** دیدێکیتری بۆ ئەم لایەنە هەیە. ئەو لە روانگەی ئەرکەوە لە رۆشنبیری، شارستانی ئەڕوانێت. بە باوەڕی ئەو رۆشنبیری، شارستانیەت ئەو بوونیادە ئاڵۆزەیە، کە خەڵکی بە هەموو ئەو کەرەسەو یاسا کۆمەڵایەتیانەی لەبەردەستیدایە هەوڵی رێکخستنی ژیانی کۆمەڵگەی پێ ئەدەن، بیرو باوەڕو بەهاو نەریتە مرۆڤایەتیەکان پێکئەهێنن، ئەوانە هۆکارێکی گەورەن بۆ مرۆڤ

تاوەکو بتوانێت خۆی لەگەڵ ژینگەدا بگونجێنێتو چارەسەری کێشەو گرفتە جۆراوجۆرەکانی بکات(١٦:١٢٠).

ئەوەتا نالی لەو روانگەیەوە چەندین جار لە شیعرەکانیدا هەوڵی جیاکردنەوەی رەهەندی مادیو کۆمەلایەتیو باوەڕو ...هتد داوە. لەوانە لە شیعرێکی حەڤدە بەیتدا ئاماژەیەکی ئیجگار ورد بە جیاوازیەکانی کچو کوڕ ئەکات، کە لە کرۆکی ئەو جیاوازیانەدا وەزیفە سەرەکییەکەی لێوە دەرخستووەو ئەڵێت:

**عیشقت، کە مەجازی بێ ، خواهیش مەکە ئیللا کچ**

**شیرین کچ و لەیلا کچ و سەلما کچ و عەذرا کچ**(١٤:١٥٧)

**تاوەکو ئەگاتە کۆتایی شیعرەکەو ئەڵێت:**

**بابێکی هەیە دونیا بۆ عەشقی مەجازی ، بەس**

**((نالی)) چییە ئەو بابە : ئادەم کوڕ و حەووا کچ.**(١٤:١٦٢)

تەنانەت هەڵسەنگاندنی شیاو هەیە بۆ ئەو شرۆڤانەی، تاوەکو ئێستا کراون بۆ ئەم شیعرە. لە جیاکردنەوەی وەزیفەی باوەڕو کاری رۆژانەو ئەرکی خۆشەویستیو ...هتد. نموونەی زیندوو لە نێو دیوانەکەیدا هەیە. لە یەکێک لەو نموونانەدا ئەڵێت:

**ئەم ئەرضە مزرەعەی عەمەلە و گوڵخەنی ئەمەل**

**هەندێ بووە بە مەسجید و هەندێ بە مەزبەلە**(١٤:٤٦٧)

یاخود لە توانای خۆیەوە لە ئایین ئەدوێتو ئەڵێت:

**((نالی)) نییەتی سیحری بەیان حیکمەتی شیعرە.**

**ئەمما نییەتی قووەتی دڵ ، قودرەتی ئینشا**(١٤:٧٨)

نالی تەنها لە بواری خۆشەویستیو عەشقدا نەوەستاوە، بەڵکو ئاماژەی بە زۆر بابەتی ئەو بوارانە داوە وەک، وەرزەکانی ساڵ، کە ئەڵێت:

**رووم ئەوا زەرد بوو وەکوو پایز لە هیجران ((نالیا))**

**عەشق ئێساکەش لە من سەیلی بەهارانی دەوێ !**(٧٠٣:١٤)

نالی لە شرۆڤەی پێناسەکانی رۆشنبیریو شارستانیەوە دیدێکی وامان ئەداتێ، کە ئەو بوارانە بەرەو پێداویستیە بایۆلۆژییەکانیش رێچکە بگرن. نالی پێ داگریی لە سەر ئەو کردارانە ئەکاتەوە، کە وابەستەو پاڵنەری پێداویستیە دەروونیو ئەرواییەکانی (رۆحییەکانی) مرۆڤن. مەبەستی ئەو لە زۆربەی زۆری شیعرەکانیدا فاکتەری رەمەکو پاتۆلۆژی ***pathology*** (اباحة) نییە، بەڵکو لای نالی بە شێوازێکی مرۆڤانەی ئەوتۆ مرۆڤ شۆڕەندی گونجاندنە بە شارستانیو رۆشنبیرییەوە، کە هاوسەنگی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدا بە دەست بهێنێت.

زانست هەوڵی بەردەوامی مرۆڤە لە دەرەنجامی کۆمەڵێک واتاو بۆچوونو باوەڕو راستی رای تایبەتو هەڵسەنگاندنی رای گشتیەوە بەرجەستە ئەبێت. بۆ بەلاوەنانی گشت، یاخود بەشێکی زۆری ئەو بەربەستانەی هزری مرۆڤ لە تێگەیشتنی راستی دیاردە مادیو مرۆڤایەتیەکان دوور ئەخاتەوە.

لە روانگەی ئەو شێوە بیرکردنەوەیە نالی لە رۆشنبیریو شارستانی نەتەوەکەیی روانیووە. هەوڵیداوە بیانکاتە قەڵغانێک بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو بابەتانەی رەوتی مرۆڤایەتیو گەورەیی مرۆڤ بەرەو لێکترازان ئەبەنو کۆمەڵگە سەرگردان ئەکەن. لەو توانا بەرفراوانەیەوە وەک پێویستییەکی سەردەمەکەی ئاماژەی گرنگی لە بوونیادنانو بەرجەستە بوونی جەستەی نەتەوایەتیدا دارشتووە.

جگه لەو داكۆكی كردنو هەوڵە زۆرەی بۆ سەپاندنی زمانی كوردیو ئاشكرا كردنی گەورەیی بەرامبەر زمانەكانیتری ناوچەكە لە چەندین بواری بەراورددا. وەک لەم نموونەیەیدا ئەڵێت:

**((نالی)) كە ویقاری نییە ، بێ باكە لە خەڵقی**

**صۆفی كە سلوكێكی هەیە ، عوجب و ریایە** (٥٦٥:١٤)

یان ئەو رەخنە كۆمەڵایەتیانەی ئاراستەی بیری خەڵكی كردوونو چەندین دیاردەی دزێوی ئاماژە پێداوە. لە یەكێک لە شیعرەكانیدا ئەڵێت:

**ریشەكەی پان و درێژە ، بۆ ریا خزمەت دەكا**

**ظاهیرە هەر كەس بەطول و عەرضی ریشیدا ریا** (١٢٨:١٤)

یاخود دەڵێت:

**شێخم، چ گەرمە حەڵقەیی ذیكرت بە رەش بەڵەک !**

**حاڵی ئەمانە خۆ بە جەنابت موحەووەلە !** (٤٦٧:١٤)

نالی لە پاڵ ئەمانەشدا توانیویەتی ترۆپكی خۆشەویستی راستەقینەو بە تەنگەوە هاتنو ...هتد لە كرۆكی مرۆڤدا بناسێنێت. هەر ئەمەشە وایكردووە چەندین كەسایەتی ئەو سەردەمەو تەنانەت ئێستاش لە واتای بەرفراوانیو مەبەستی شرۆڤەیی شیعرەكانی بكۆڵنەوەو بەراوردی بكەن.

نالی خۆی گرنگی گەورەیی خۆیی بەچاكی درک پێكردووە. ئاماژە بە گرنگی بوونی خۆییو دڵسۆزی خۆی ئەكاتو ئەڵێت:

**مەڵێن كەڵكی نەبوو ، رۆیی ، چەهەننەم !**

**سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەضاتان** (٣١٨:١٤)

ئەو بابەتانەی، کە نالی ئاماژەی پێداون لە بیرێکی یەکجار چڕەوە بەرجەستە بوونو بیری جیاوازیان لێ دەبێتەوە، تاوەکو ئەو ساتەی باوەڕی بوونی ئەو یاسا مرۆڤایەتیانە لای خوێنەری دروست ئەکات. ئەو یاسایانەش ئەو چمکانەن، کە کاروباری کۆمەلایەتی بەڕێوەئەبەن. بۆ نموونە لە سیستەمی ژنو مێردایەتیدا تەنها سێکس بابەت نییە، بەڵکو نالی ئەو سنوورە ئەبەزێنێتو چەندین بۆچوونی وەک خزمایەتی، ئایین، یاسا، مۆراڵ، ئابووری ...هتد ئاماژە ئەداتو کارلێکی زیندوویان تێدا دروست ئەکات. لە ئاوەدانیو ئاسوودەییدا یەکیان پێ ئەگرێتەوە.

لە شاکارێکیدا بەم شێوازە پڕ بەهایە چووەتە نێو ئەو بوارەو ئەڵێت:

**جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا**

**(حەبیبە) ی (ماڵیاوا) ماڵی ئاوا !**

**حەلاڵی بێ نیکاحی حۆری عینم**

**بە جوتێ ناظیری شەرع و فەتاوا**

**زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم ،**

**موبارەک حوجلە بێ بۆ بووک و زاوا**

**صیداقی ڕوونماوو ، وەصلی شاهید**

**لەگەڵ شایی کەران بێ دەنگ و داوا**

**ویصاڵی بێ کەم و کەیفی حوضووری**

**لە ((نالی)) گەر دەپرسی ، یەعنی ئاوا** (١٤: ١٢٢- ١٢٤)

ئەم نموونەیە چەندین بۆچوونی رۆشنبیریو شارستانی تێدایە لە چەندین رووی ئایینی، کولتووری، چەمکو ئارەزووی مرۆڤەوە[٣].

لە دیدی ئەم مەزنەدا رۆشنبیری بەرزترین هێزی دروست بوونو گونجاندنەو ئەرکەکان لەوێدا دەرئەکەون. رووی فێربوون، یاسا، رەوشت، هەموو ئەمانەی لە پەروەردەوە بەرجەستە کردووەو توانای جێبەجێبوونی داونەتێ. بەو بەهاو نەریتەوە داهێنانێکی نوێو چێژێکی وای تێکەڵاو کردووە، کە لەگەڵ چێژو تواناو سروشتی رۆشنبیری، شارستانی، کولتوورەکەیدا هاوسەنگی کردوونەتەوە. ئەمانە لە شیعرەکانی نالیدا راستینو بە ئاشکرا دیارن.

لای نالی هونەری وریایی لە رسکانو سیستەمی کۆمەڵایەتی باوی کۆمەڵگەدا متمانە ئەکاتە سەر خاڵێکی مرقانەی گرنگ ئەویش ئاماژە کردنە. توانیویەتی ئەو بیرکردنەوە بێ هاوتایانەی، کە لە سنووری زمانەوانیدا خۆی ئەنوێنێتو لە توانای نالی خۆیدا بووە کاری نوێیان لێ دابهێنێت. هەر بۆیە ئەو پێگە دیارەشی بۆ خۆی بونیادناوە. وەک لە دێڕێ شیعری پڕ ئاماژەی لێوانلێوی زانیاریدا ئەڵێت:

**سۆزشێکی نەفەس و شۆڕشی نائیی نابێ**

**هەریەکە نەوعە غینایێکە ، بە مەعنایێکە**(٤٦٢:١٤)

پەروەردە بە یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی رۆشنبیری، شارستانی دائەنرێت. جگە لەو یەکە گرنگو کارایانەی پێشتر باسمان لێوەکردن ئەوە رۆشنبیری، شارستانی خاوەنی چوار کۆڵەکەی پتەوە.

**یەکەمیان:** رێکخستنی ئابووری.

---

٣- بڕوانە چەپکێک لە گوڵزاری نالی، مەسعود موحەمەد، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

**دووەمیان:** شێوازی یاسا. سیستەمی بەهاکان ئەگرێتەوە.

**سێیەمیان:** پێکهاتەی سیاسی.

**چوارەمیان:** شێوازی پەروەردەیە[٢١٢:٢١].

ئەم کۆڵەکانە ئەو کۆڵەکانەن، کە رۆشنبیریو شارستانییان راگیر کردووە. چەندین راڕەوو چەندین بانیژەی لەسەر دروست بووە، کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیان لە سەر وەستاوە. ئیتر ئەو کۆمەڵگەیە لە هەر ئاستێکی پێشکەوتندا بێت. وەک ئەو شاکارە مێژووییەی بۆ سوپای ئەو سەردەمەی قەڵەمڕەوی بابانی وتووەو ئەڵێت:

**ئەم طاقمە مومتازە کەوا خاصصەیی شاهن**

**ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**

**تائەگاتە کۆتایی شیعرەکەو ئەڵێت:**

**((نالی)) بە خودا حەیفە دەرەنجێنی دڵی خۆت**

**ئەم طاقمە مەخصوصە هەموو صاحیبی جاهن**[١٤: ٣٤٠-٣٤٥]

لەو سەردەمەدا هەموو کەس نەیتوانیووە بەو شێوەیە لەو بوارانە بدوێت جگە لە دەستەیەک خەڵکی بەتوانا نەبێت، کە لە ناویاندا تاوەکو ئەمڕ ئەم مەزنە مرۆڤەی کورد (نالی) وەک ئەستێرە بە ئاسمانی رۆشنبیری، شارستانی ئەم نەتەوەیەوەئەدرەوشێتەوە.

لە روانگەی (**ئێدوارد ساپیر**)ەوە رۆشنبیری، شارستانیەت تەنها خەڵکانی تایبەتمەندی وەک مێژوونووسانو ئەنترۆپۆلۆژیەکانو ئێرکۆلۆژیەکانو...هتد ئەگرێتەوە، کە ئەتوانن بەکاری بهێنن. **ساپیر** رۆشنبیریو شارستانیەت بە پێکهاتە مادیو نامادیەکانی ژیانی کۆمەلایەتی کۆمەڵگە ئەداتە قەڵەم[٢٣١:٨]. بەم واتایەی

ساپیر بێت رۆشنبیری، شارستانی لە هەر ئاستو پلەیەکی پێشکەوتندا بێت ئەوە واتایەکی کۆگیر لەگەڵ مرۆڤدا بەرجەستە ئەکات. دیوێکی تری رۆشنبیری، شارستانی ئاماژەیە بۆ کەسایەتی مرۆڤ خۆی، وەک ورووژێنەریکی داهێنەری بیریو بەکارهێنانی توانای ئەو بیرکردنەوانەیە لە بوارە جیاوازەکانی ماریفەتدا.(٨٠:٩)

لەم لایەنەوە نالی خۆی بە چاکی هەستی بە ئاستی گەشەی بیرو سەلیقەو توانای داهێنەرانەی خۆی کردووە. لە شیعرێکیدا لە دڵسۆزیو بەتەنگەوە هاتنیەوە هاوار بۆ خەڵکی ئەکات، کە بێن سەلیقەو ئەزموونیان بداتیو تووشی هەڵە نەبن. ئەڵێت:

**خەڵقی کە هەموو کۆدەکن و بەستە زوبانن ،**

**با بێن و لە ((نالی)) ببیەن شیعری سەلیقی**(٦٥٧:١٤)

واتە رۆشنبیریو شارستانیەت لە گۆڕاندایە. ئەو گۆڕانکاریانە وەک خەسڵەتێکی دیارو تایبەتی بە مرۆڤەوە ئەلکێن، بەو مەرجەی توانایی بەدەست هێنانو داهێنانو بەرفراوانی لە زانستی مادی یاخود کۆمەڵایەتیدا هەبێت. واتە روونبیر تاکە کەسێکە نەک هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە.

چەمکی رۆشنبیریو چەمکی شارستانی هەندێک جار لەگەڵ میراتی لایەنە نامادییەکانی کۆمەڵگەدا تێکەڵ ئەبنو داهێنانی نوێیان تیادا ئەدۆزرێتەوە. ئەچنە خانەی بەدەست هێنانە مرۆڤایەتیەکانەوە. لەگەڵ بوارەکانیتردا تێهەڵکێش ئەبنو ئاستی بەرەو پێشچوونی تیادا دەرئەکەوێت. بۆ ئەو مەبەستە هەندێک هۆکار هەڵئەبژێردرێت، کە ببنە گرنگترینو گەورەترین هۆکاری پەیوەست بوونی هزر بە رۆشنبیری، شارستانیەتەوەو پێوەی ئەلکێت(١٢٥:٩). نالی لەم لایەنەوە وابەستەیەکی ماریفی گەورەی داهێناوە. بە ئالوگۆڕ کردنێک مەگەر هەر لە توانای خۆیدا بووبێت

ئەو کێبەرکێ هزرییە بەرفراوانە بکات. بزانە لەم ئایەتەوە: (**مثل نوره کمشکاة فیها مصباح**) چیمان پێ ئەڵێت:

**جامی تاقی مەیکەدە میشکاتی قیندیلی دڵە**

**شیشە پڕ قەرقەف لە ڕەفرەف شاهی عالی ڕەفرەفە**[٤٥٤:١٤]

نالی جگە لەو شیعرە چەندین پارچە شیعری نایابی‌تری هەیە لەوانەی، کە بۆ مردنی باوکی حەبیبەی گوتووە لە دیوانەکەیدا، **ل١٣٧-١٤٤**، یان بۆ بێ مەیلی خودی حەبیبە خۆی، کە لە چەند لایەنێکەوە لە ڕۆشنبیریی‌و شارستانی دواوەو لە دیدی خۆیەوە ئاماژەی ئەو بەراوردەی بە چەند بنەمایەک کردووە[٤].

نالی وەک زۆر بیرمەندی تری دنیا لە زۆر لایەنی سایکۆلۆژیی‌و کۆمەڵایەتیەوە لە ئایینی ڕوانیووە، کە بە بیرێکی مرۆڤانەی وابەستەی دڵی مرۆڤ‌و خوای زانیووە. وەک جۆرێک دڵسۆزی هەست‌و دڵی وابەستەی بوونەوەرێک کردووە، کە زۆر لە خۆی بە هێزو گەورەترە، هەر ئەمەشە بە گشتی وا لە مرۆڤ دەکات، کە بپاڕێتەوەو پەنا بۆ نوێژو ریتوالی(طقوسی) جیا جیا ببات. چیی‌و کامەی بەلاوە بەرزترو گەورەتر بێت ئاماژەو گرنگیی‌و بۆنەی تایبەتیان بۆ ڕێک بخات. هەموو ئەمانە لە لاوازی مرۆڤەوە بەرجەستە بوون. نالی لەم ڕوانگەیەوە ئەمەندە باوەڕی بە خۆی هەبووە لەو هۆش‌وگۆش‌و بیرە بەرفراوانەیەوە دەستی زانست‌و زانیاری گرتووەو گۆڕانکاری بونیادنەرانەی لە بری لاواز بوون تیادا دەرخستووە:

**ئەشکم ، کە لەگەڵ عەشقمە ، طیفلێکی فەهیمە**

**هۆشم ، کە لەگەڵ خۆشمە ، پیرێکی نەزانە**[٤٧٨:١٤]

---

٤-(بڕوانە دیوانی نالی، ل ٥٩٢-٥٩٦).

ئەمە هەر ئەوەیە، کە فەیلەسوفی یۆنانی **(ئەبیکۆرۆس)** ئاماژەی پێداوە بەرامبەر بە جەنگی بەردەوامی نێوان بیرو حەزو ئارەزوو. ئەتوانرێت لێرەوە هەست بە سەرکەوتنی بیرو بەلاوەنانی سۆز لای نالی بکرێت. خۆ ئەگەر تەماشایەکی شیعری پاڕانەوەی مەدینە بکەین لە دیوانەکەیدا لە شیعرێکی ٧٤ بەیتیدا ئەو ڕاستیە ئەسەلمێنێت، کە وابەستەی بیرەو نالی وەک نالی خۆی ئەناسێنێت و ئەڵێت:

**مورادم ذیللەت و پاڕانەوەی حاڵە ، نەوەک نەعتە**

**بە چەن بەیتێکی کوردانە ، کە قورئانت ثەنا خوانە**

**ئەگەرچی کوردی دووری شارەزووری قەسوەتم ، ئەمما**

**وەسیلەم طەیبەوو حلمی شەفیع و فەضلی مەننانە**(٥١٧:١٤)

ئەمە بەشێکە لەو گۆڕانکاریە هزریانەی ڕۆشنبیری، کە هێزی نوێ بەرەوڕووی نۆژەنبوونەوە ئەکاتەوە، تاوەکو هەرچی پشکۆڵە بە دەرگاکانی زانستەوە بکرێنەوە شوێنی زیاتر، بیری گەورەتر، کاری نوێتر بێنە کایەوە. نالی خۆی ئەم ڕاستییەی ئاماژە پێداوە، کە ئەڵێت:

**حیرەت زەدە وا دیدە وەکو حلقەیی دەر ما**

**بێمایە نییە عاشیقی بێچارە ، (بفرما) !**(١١٨:١٤)

لەم ڕوانگەیەوە لە چەندین شوێن و بۆنەیتردا گرنگی کاری بیری دیاری کردووە. لە شاکارە شیعرەکانیدا بەکاریهیناون. بۆ نموونە سەیری ئەم شاکارە بکە:

**بێش و کەم بێ شکەم و حیرص وەکوو طیفلی ڕەضیع**

**زاویە بێشکەم و بێ شکم و بێ حییەلم**(٢٩١:١٤)

بەرهەم هێنانی رۆشنبیریو شارستانی یەکێکە لەو بەرهەمانەی تەنها مرۆڤ خۆی خاوەنیەتی بە هۆی گرنگترین بنەماوە، کە بریتیە لە زمان؛ لەم رێگەیەوە رۆشنبیری، شارستانی، کولتوور، بوونو مێژوو کۆئەبنەوەو لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر ئەگوێزرێنەوە، بنەمای بیریو هونەریو زانستی لەسەر دائەرێژرێت، هەر لە سەرەتاوە نالی بەو شێوەیەی خۆی مەبەستی بووە ئەم لایەنەی یەکلا کردۆتەوە، نامەی بەرگریو دڵسۆزیو بە تەنگەوەهاتنی خۆی گەیاندووە. ویستی بووە گۆڕانکاری بونیادنەرانەی لە سەر دارێژێت. ئەم راستیە لە کرۆکی ئەم شیعرەی نالیدا بە تەواوی بە رچاو ئەکەوێت:

**شاهیدی فیکرم ، کە بێتە جیلوە گاهی دولبەری**

**شاهی خوسرەو رۆحی شیرینی بە قوربانی دەکا**

**نووکی خامەی من ، کە بێتە مەعنا ئاراییی کەمال**

**خەط بە خەط  ئیظهاری نەقشی صورەتی (مانی) دەکا**

**ئیستیطاعە و قووەتی طەبعم ، بە کوردی و فارسی**

**عارەبی ، ئیظهاری چالاکیيو چەسپانی دەکا**(١٠٣:١٤-١٠٤)

هەر لێرەشەوە تواناو هێزی زمانی خستۆتەکارو مەبەستی بووە ئەو بنەمایانە بپارێزێتو خەڵکی لەو زانستە بەرفراوانە ئاگادار بکاتەوە، کە ئەڵێت:

**شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی ؟!**

**کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا ؟!**(١٠٧:١٤)

بنەماکانی رۆشنبیری ئەگەر لە شاکارەکانی نالیدا بخەینەڕوو هاوشێوەی کردارە کۆمەڵایەتیەکان ئەبنەوەو ئەبن بە ڕێچکەی سیستمێک، وەک هەر بەشێک لە پێکهاتەکانی شارستانی ژیانی مادیو کۆمەڵایەتیدا بەشدار ئەبن(٥).

نالی لە (ڕەواڵەتو ناوەڕۆکو ئەروا)(٦)وە بە نێو سروشتی رۆشنبیریدا شۆڕبۆتەوە، سێ بنەمای گرنگی لێ بەرجەستە کردوون: بنەمای یەکەمیان کەسایەتیو دووەمیان ڕاستیە مادیەکانو سێیەمیان تانو پۆی ڕایەڵەی پەیوەندیەکان. لە یەکێک لە شیعرە بەرزەکانیدا ئەڵێت:

**ساقی وەرە ڕەنگین کە بە پەنجە لەبی ئەقداح**

**بەم ڕاحە ، لە سەر ڕاحە ، دەڵێن : ڕاحەتی ئەڕواح**

**بەم کاسە لە سەر پەنجە دەڵێن : نوری علا نور**

**ڕەخشانە لە میشکاتی قەدەحدا وەکو میصباح**

**قەطرێکە لە بەحری کەرەم و ڕەحمەتی فەتتاح**

**نەک عارەقی کەرمی عینەب و شەربەتی توففاح**

**بەو دەستە کەوا مەرهەمە بۆ ئەم دڵە خەستە ،**

---

٥- بۆ نموونە پێکهاتەی ئابووری بەندە بە کۆمەڵێک پێکاهتەی سیستەمی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیەوە، کە ئاسوودەیی خەڵکەو چەندین لکو پۆپی وەک بازرگانی کشتوکاڵ خزمەتگوزاری لێئەبێتەوە. کە هەوڵی بەدەستهێنانی ئەرکی دابینکردنی بژێویو شوێنو ...هتد ئەدات. هەر ئەم پێکاهاتەیە بواری خێزانو سیستەمی سیاسی ئایینیو ئێرکیۆلۆژی بە هەردوو بەشەکەیەوە دیاریئەکات. بنەمایەکە بۆ دابونەریتو بەهاو زمان، کە زۆر بابەتیتر دیاری ئەکاتو

٦- ڕەواڵەت بریتیە لە شێوازی دەرەوەو ڕووبەرو قەبارەو ماوەی وەسفو مێژوو ...هتد. ناوەڕۆک: بریتیە لەو هەستەی لەو ڕەواڵەتە ئەدوێت، لە ڕووی ڕەسەنایەتیو پیرۆزیو خۆشەویستیو ڕاستگۆییو خۆبەخشینو ... ئاوەکو ئەو کاتەی لەگەڵ ئیستاتیکادا، ئاوێتەی یەک ئەبنو لە کۆتایدا وەک ڕۆح ناو ئەبرێت، لە ڕێگەی ڕەمزەوە هەوڵ دەدات ڕاستیە نادیارەکانی دەربخات.

**بەو پەنجە کە بۆ بابی گوشایش ئەوە میفتاح ،**

**بەو دەننی فوراتە کە دەکا پەششە بە عەنقا ،**

**نەک لەو خومی نیلە کە دەکا باخە بە تیمساح ،**

**پڕ کە قەدەحێ پڕ فەرەحی بێ تەڕەح و غەم**

**ناولني ، و ناد مني و غاز لني بالأفراح**

**لەم گەردشی مینایە کەوا دەورە ، نە جەورە**

**ساقی کەرەمی سایقە ((نالی)) مەکە ئیلحاح**[(١٤:١٦٤-١٦٧)]

ئەو دابەشکردن‌و شرۆڤەی رۆشنبیریە لە شیعرەکانی ئەم مەزنە مرۆڤەی کوردا ئەوەندە گەورەن لە رێگای بەدواچوون‌و لێکۆڵینەوەوە ئەسەلمێت، کە لە کام ئاستی بەرزی بیرکردنەوەدان. بۆ ئەو کلێشەیەی ویستی باسکردنێتی‌و ئەیخاتە خانەی رێکخستنەوەو بوونیان ئەداتێ. نالی هەوڵیداوە بەو زانست‌و زانیاریەی بە دەستی هێناون لە سنووری خەسڵەتی مرۆڤایەتی دەرنەچێت. لە هەمان کاتیشدا پارێزگاری لێکردووەو بەرز رایگرتوون. تێڕوانینی مرۆڤایەتی لە هەموو ئەو شیعرانەدا هەست پێ ئەکرێت، کە باس لە عەشق‌و خۆشەویستی راستەقینەی مرۆڤ ئەکەن. وەک خۆی ئەڵێت:

**چاوی من بەحری موحیطی تۆیە بۆ دەفعی گەزەند**

**لێت موعەییەن بێ کە ((نالی)) گوڵ بە دڵ پەرژین دەکا**[(١٤:١١٤)]

لەم بەرفراوانیەوە راستیەکی گەورە بۆ ئێستای مرۆڤ ئەسەلمێنێت، کە مرۆڤ بەرهەمی رابردووە. چ پێویستی بە ئاڵودە بوونی مادی پارەو پێگەی داهاتووی نییە.

پێویستی بە ژیانی پڕ سەروەریو ئازادو خۆشەویستی ئێستایەتی. لەم پارچە شیعرە نیو دێرە عەرەبییەدا ئەو خەسڵەتە مرۆڤایەتیە بە ئاشکرا هەست پێئەکرێت:

**دنیا بە فیدای قەددی بکە ، دامەنی بگرە**

**طوبى لمن اختار على المال مآلا !**(١١٨:١٤)

نالی لە ژینگەیەکی دیاریکراوی سنووردارەوە توانیویەتی مێژووی قۆناغێکی دیار بۆ نەوەکانی دوای خۆی دەستنیشان بکات، بە شێوەیەکی زۆر نایاب مێژوومان بۆ باس ئەکات:

**شاهی جەم جا ((نالیا)) (تأريخ جم) تەئریخیە**

**دا نە لێن لەم عەصرەدا ئەسکەندەری جەم جا نەبوو**(٣٧٤:١٤)

ئەمەش واتای گواستنەوەی رۆشنبیریو شارستانی مسۆگەر ئەکات. لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیترو چەندین کەسایەتیو زمان ناسو مێژووناسو ...هتد پاش خۆیی لێوە پێدەگەن. ئەم لایەنە لە بڕیاردانی بە تواناییو ئازایەتی مرۆڤ خۆیەوەیەتی، بە مەبەست بێت، یاخود بێ مەبەست. تایبەت بێت، یاخود گشتی. ئەوە بەپێی پێویست بنەمای بە دەستهێنراوی تری لە سەر کەڵەکە ئەبێتو رۆشنبیری مرۆڤایەتیو نەتەوەیی پێ دەوڵەمەند ئەکات.

نالی هەر لە سەرەتاوە متمانەی کردۆتە سەر ئەو زانیاریو زانستو ئەزموونانەی لەو سەردەمەدا بە دەستی هێناون، کە بە شێوازێکی گونجاو کردوونی بە بنەمایەکی رۆشنبیری ناوچەکەو دەوروبەری لە بوونی نەتەوەیەکی وەک خۆیان پێ ئاگادار کردۆتەوە. وەک خەسڵەتێکی مێژوویی بەدەستهێنراو بەکاریهێناوە بۆ پێگەیاندنی ئەو مەبەستە.

پەند وەرگرتن لە مێژویی کۆمەڵگە لای ئەم مەزنە زۆر گرنگ بووە گرنگیەکی واقیعی تەواوەتی پێداوە. ئەوەتا لە پارچە شیعرێکدا ئەگەر بە دواچوونی بۆ بکەین باسی ئەسکەندەری مەکدۆنیو شکاندنی دارویش ئەکات، کە بۆ ئەو سەردەمەو ئێستاش وەبیر هێنانەوەیەکی هەرە گرنگو زیندووە[٧].

لایەنێکیتری رۆشنبیری لای نالی ئەکرێت لە بیرکردنەوەو کردارو رەفتاردا ببینرێنەوە. ئەم بنەمای رۆشنبیریانە لای نالی وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا لە بوارە مادیو کۆمەڵایەتیو ئاماژەییەکاندا دەرکەوتوون. لە ژینگەی مادیەوە کەرەسەو ئاسەوارو دارو پەردووی سروشتی گۆڕیووە، کە نەیهێشتووە لە رووی کۆمەڵایەتیو ئاماژەوە گاریگەریە مرۆڤانەکەیان ون بکەن. بەڵکو لە داڕشتنیدا ئاستی بەرزی رۆشنبیری پێوە لکاندووەو مۆرکە خۆماڵیە کوردییەکەشی لێ دانەماڵیوون. لە بیروبۆچوونو کردەوەدا وابەستەیەکی هاوسەنگی واقیعی کۆمەڵایەتیو هەڵسوکەوتی کردووە.

**مەهـ بەشەو هەڵدێ ، پەنا دەگرێت و دەنوێتن بە ڕۆژ**

**دا بگاتە سیرڕی پەچچەی پەرچەم و وەصفی برۆی**

**گەر بڵێم : شەمسی ، دەڵێ : ئەو خۆش ڕووە بێ پەردەیە**

**وەر بڵێم : سەروی ، دەڵێ : ئەو ئەحمەقە کوا گفتوگۆی !**

**دیدەوو دڵ هەر دو وا جۆبار و جۆیای قەددی تۆن**

**سەروی دڵ جۆی عەرعەر و ، دڵ جۆی نەمامی دیدەجۆی**

**چونکە باوکی ڕۆمیو دایکی حەبەش بوو ، ما بە بەین**

---

٧-(بږوانە: ل٢٥٥ لە دیوانی نالی.)

**ڕۆژ و شەو ، کافور و میسکی ، ڕوو گەنم خاڵ دەنکە جۆی**

**من گوتم : سەروی قەددت مەوزوونە ، ئەو طەبعەم هەیە**

**ئەو گوتی : ((نالی)) بە میزابی کینایەتمان دەشۆی**(١٤:٦٩٤-٦٩٧)

ڕوونبیری ئەم مەزنە لە کۆمەڵێک کردارو ڕەفتارو بیری جیاجیا پێکهاتووە. بابەتی ئایینی، کۆمەلایەتی، هونەر، بەها، زمان، وشە ئارایی ئاوێتەی یەکتری کردوون. لێرەدا بابەتێکی گرنگ دەرئەکەوێت، کە بریتیە لەوەی هیچ کارێک ناکەوێتە خانەی ڕۆشنبیرییەوە ئەگەر مۆرکی ئیرادە (ڤالیا)و شوێن دەستی مرۆڤی پێوە نەبێت. لەبەرئەوەیە نالی هەوڵیداوە شیعرەکانی لە سنووری کردەوەو توانای مرۆڤ بەدەر نەبێت. کردوونی بە بیرۆکەیەکی گشتیو چەندین بواری باوەڕو زانستی پێوە گرێداوون. واتای ڕاستەقینەی خۆشەویستیو مرۆڤایەتی لێهێناونەتە بەر.

**ناری سینەم گەر نەبێ ، غەرقم ئەمن**

**ئاوی چاوم گەر نەبێ ، سووتاوم ئەز**(١٤:٢٢٢)

لە هەمان کاتدا بنەمایەکی کۆگیر لە بەدواچوونو بەراوردو هەڵسەنگاندنەکانی ڕۆشنبیری لای نالی بەدی ئەکرێن. زۆر کەسی ئەو سەردەمەو ئێستاش هەبووەو هەن، کە چەند زمانێک جگە لە زمانی دایک بزانن. بەڵام نالی ئەو لایەنەی کردۆتە بنەمای گۆڕانکاریو هەڵوێستی ئاشکرای ئازادانەی کوردانەی خۆیی لەسەر دەربڕیووە. خۆی بڕیاری بەلاوەنان، یاخود پەسەند کردنی داوون. وەک لەم دێڕەدا ئاماژە بە تواناو دەسەلاتی ئەو هەڵوێستو بڕیارو توانایانەی خۆی ئەکاتو ئەڵێت:

**موحەققەق مەشرەبی ((نالی)) لە شیعرا هەروەکو ((خاکی))**

**خەیاڵی ((کوردی)) یە ، بەیتی سەراپا زولفی دوو تایە.**(١٤:٥٧٠)

یاخود ئەڵێت:

**خەرقە پۆشێ کەی دەپۆشێ جەوهەری ذاتی ئەمن ؟**

**بێتە نێو ، جیلوەی ، بە زوشتی خۆی بەعوریانی دەکا**(١٠١:١٤)

یان لەوپەڕی لەخۆ رازیبوونەوەیە، کە ئەڵێت:

**ضابیطەی طەبعم سوارە ، ئیددیعای شاهیی هەیە**

**موحتەشەم دیوانە ، داوای تەختی خاقانی دەکا.**(١٠٢:١٤)

بنەمایەکی رۆشنبیری، شارستانی تایبەتمەند لە شیعرەکانی نالیدا بەرچاو ئەکەون. هەر شۆڕبوونەوەو هەڵکشانێک بە نێو دەریای شیعرەکانیدا بە ئاستو پلەی تایبەتمەندی زیاتردا پەلکێشمان ئەکات. هەموو دابەشکردنێک بۆ لێکدانەوەی شیعرەکانی چەندین تایبەتمەندی بەرفرەوانی نوێ بە دوای خۆیدا دەرئەخات، کە ئەبنە سەرچاوەی گرنگ بۆ بەراوردو بەدواداچوونی ئەم بوارە. هەر وەک لەم شاکارەدا چەندین بەدواچوونو واتای تیادا ئەبینرێتەوە، کە ئەڵێت:

**لە کن ئەو جەوهەرە فەردە لە هیوولا**(٨) **نییە باس**

**لە حیکەم پەروەریی بو عەلی سینا نییە باس**(٢٣٣:١٤)

ئەمانە ئەوە ئەسەلمێنن ئاڵاو والاییەکی بەرفرەوانی رۆشنبیری لای ئەم مەزنە مرۆڤەی کورد لە زۆر بواری جیادا بەرجەستە بووەو بیری دروستی بۆ

---

٨- لە تاقە دێڕی هۆنراوەیەکدا، چ حیکمەتێکی نیشانداوە دیارە جەوهەر گەردەو ئیتر لەو بچووکتر نابێتەوە، هیۆلی ماددەیە حیکەن جەمعی حیکمەتە ناوی یەکێک لە زاناکانیشە ئێستا بۆ فەلسەفەو پزیشکیو سروشتناسیو دەروونناسیی بەکاردێت. ئیبن سینا زانای بەناوبانگی ئیسلام ٩٨٠- ١٠٧٣ لە بوخارا لە دایکبووەو لە هندستان مردووە هیولی هەم مادەیەو هەم بە (هەیە ولاء) ش دەخوێنرێتەوە واتە هەیەو نیە ئەمە ئاماژە بە حیکمەتو پەروەردە نادات؟ (بڕوانە دیوانی نالی، ل ٢٣٣- ٢٣٧)

دارشتوون. له هەندێ کاتدا ئەیانباته ئاستی دژوەستانو پەیڕەوی یاسای دژایەتیەکان ئەکات. وەک ئەو خەوەی بە مەستورەی ئەردەڵانی‌یەوە خستوویەتیە سەر کاغەز، کە هەندێ جار ئامۆژگاری، هەندێ جار ئەچنە خانەی تاوانەوە، لە هەموو رەوشەکانیشدا مەبەستەکەی پێکاوە[٩]. بواری پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵگەو تاکەکەسدا ئەگەر سنوری هەبوو بە هەمان ئاست رۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتووریش سنوردار ئەکاتو لە ئاستی سەرەتاییدا ئەیانهێڵێتەوە. بە پێچەوانەوە ئەگەر بەرفراوانی پۆزەتیف لە پەیوەندییەکانیدا بەرجەستەبێن ئەوە گەشەو پێشکەوتن‌و گۆڕانکاری رۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتوور زیاتر جموجۆڵی تێئەکەوێت. هەر وەک چۆن لەم دواییەدا کتێبێکی نالی لە ئیستانبوڵ دۆزرایەوە باس لە شێوەی نامە نووسین، یاخود دارشتن دەکات[١٠]. یاخود لەو (مناضرە) یەی نالی لە حیجاز پلەی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە[١١] ئەمە بواری کرانەوەی پەیوەندیەکانە، کە تاوەکو چ ئاستێک کاریگەری لە رۆشنبیریدا ئەگێرێت. ئەم لایەنە ئەوە ئەسەلمێنت بنەما مادی‌و کۆمەلایەتیەکانی رۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتوور مرۆڤ خۆی دروستی کردوون، ئەکریت لەو پێکهاتانەوە بنەی دامەزراندن‌و نۆژەن بوونەوەیان لە سەر دارێژرێت. گۆڕانکاری بە بنەما لە بەڕێوەبردنی ژیانی رۆژانەو

---

٩- بڕوانە دیوانی نالی ل٦٠٣-٦٣٠

١٠-سەیری مناظر الانشاء، تقدیم وشرح الابیات الاعربیة بالفارسیة الملا خضر النالي الشهرزوري، چاپخانەی ژین ٢٠١١.

١١-دکتور دڵشاد علی، نالی لە بازنەی تاقیکردنەوە شیعرییەکەی کرمانجی خواروودا، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، بەشی B، ژمارە ١٤ مانگی حوزەیرانی ٢٠٠٤.

ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا بەرجەستە بکات. هەموو ئەو مێژووە لە ئاستی گەشەو پێشکەوتنو گۆرانکاری خۆیدا بەکار بهێنێت.

### ٣. داهێنان لای نالی

بیروبۆچوونی زۆر لە سەر داهێنانو بوارەکانی داهێنانی هونەرو شیعرو زانستە سروشتیو تەکنەلۆژییەکان هەیە، هەر لە سەدەکانی پێشانەوە بە تایبەتی لەلایەن سایکۆلۆژیەکانەوە گرنگی بە بواری داهێناندراوە. ئەکرێت زۆر پێناسەو راڤەی داهێنان بنووسینەوەو واتاو مەبەستەکانی ئاشکرا بکەین. لێرەوە هەوڵ ئەدەم هەندێکیان بخەمەڕوو:

ناوەندە کۆئەندامی دەمار یەکێکە لەو بەشە گەشە سەندووە ئالۆزەی جەستەی مرۆڤ، کە تاوەکو ئێستا لەبەر ئالۆزی کارو کردەوەو فرمانو ئەرکەکانی بە تەواوەتی پێکهاتەی ئەو بەشە وابەستە جەستەییو دەرەکیەکانی بە تەواوەتی دەرنەکەوتوونو نەزانراون. بەردەوام بابەتو وەزیفەو کاردانەوەی نوێی تیادا باس ئەکرێت. لەگەڵ ئەم ئالۆزیەشدا فاکتەری دەروونی خودی مرۆڤ خۆیی بۆ زیاد بووەو لکاوە بە کردارە هزریەکانەوە، کە ئەمەش ئەوەندەی‌تر ئالۆزی کردووە. کاتێک بمانەوێت پەیوەندیی نێوان جەستەو رژێنە هۆرمۆنیەکانو کاردانەوە دەروونیەکان ئاشکرا بکەین، ئەوە تاوەکو دەست هەڵبێنینەوەو چاومان بڕ بکات ئالۆزو کرۆڵە. بۆ نموونە: دررککردن بەو پاڵنەرە نا مادیانەی، کە هانی فاکتەرەکانی پەروەردەو فێربوونو پێشکەوتنو داهێنان ئەدەن. هەموو لایەنە جەستەییو دەروونیو ژینگەییەکان ئەبنە هۆکار لە رەوتی جموجۆڵە دەماغیەکانو لەگەڵ ئەو سروشتەدا هاوسەنگیو گونجاندن دروست ئەبێت. ئەم کردارە بەم شێوە وتنە ئاساییو ئاسانە، بەڵام چەندین بابەتو کەرەسەی جیاوازی تێدا بەشدارن، تاوەکو ئەو کاتەی مانای داهێنانی هزری خۆیی دەرئەخات.

هەندێ بۆچوون هەن داهێنان وەک **دیاردەیەکی سایکۆلۆژی** پێناسە ئەکەن. لەو باوەڕدان هیچ پەیوەندیەکی بە جەستەوە نییە. هەندێکیتر وای دائەنێن، کە داهێنان کردارێکی **مۆخی** (جەستەیی ـ مادی)ەو کرۆکی کردارەکە خۆی، کە داهێنانە کۆمەڵایەتی– رۆشنبیری بەدەست هێنراوە.[٥: ١٨-١٩] لێرەوە بۆ بە دواگەڕانو بەراوردو شرۆڤەیەکی رێژەیی **سێ لایەنی سەرەکی** لە کرداری داهێناندا دەرئەکەون: **یەکەمیان لایەنی دەروونییە**. **دووەمیان لایەنی بونیادی جەستەییە** (بایۆژییە). **سێیەمیان لایەنی رۆشنبیری یاخود شارستانی کۆمەڵایەتییە**.[٢٩:٢٥٤] ئەم لایەنی سێهەمە لەم باسەدا گرنگی بەرچاوی پێدراوە. بەپێی زۆر لە لێکۆڵینەوە سایکۆلۆژییەکان لایەنی دەروونی کاریگەری ئاشکرا لەسەر دیاردەی داهێنان ئەکات. مەبەست لە بونیادی جەستەییش ئەوەیە، کە ناوەندە کۆئەندامی دەمار بە شێوەیەکی ئاسایی پێگەیشتبێت. واتە ئاسایی بێتو لادانو کەموکوڕو بێ تواناو نەخۆش نەبێت. لایەنە رۆشنبیری یاخود شارستانیە کۆمەڵایەتیەکە زۆر بوار ئەگرنە خۆیان لەوانە: کەسێتی، باوەڕ، ئەزموونی مێژووی مادیو کۆمەڵایەتی تاکەکەسو کۆمەڵگە، زمان، پەروەردەو فێرکردن، پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی. ئەمانە گشتیان بە بنەمای سەرەکی داهێنان ئەزانرێنو بە کرداری داهێنانەوەیان لکاندوە. واتە ئەو کاتانەی بمانەوێت لە کەسایەتیەک بگەینو بە بەرهەمو داهێنانەکانیدا هەڵکشێین ئەوە پێویستی بەدواچوونو بەراوردی ئەو بوارانەی پێشتر خۆیان ئەسەپێنن. بۆ نموونە زۆرجار هەندێ بابەتو کەرەسەی مادی، یاخود کۆمەڵایەتی هەن بەردەوام لە ژیانی رۆژانەدا دووبارەو چەندبارە دێنە بەرچاو، یان گوێ بیستیان ئەبین، یاخود بەرەوڕوومان ئەبێتەوە، کە جگە لە کاردانەوەو هەڵوێستی ناسینی ئاسایی

بەرامبەریان بە دەگمەن نەبێت نابنە فاکتەری داچڵەکاندنی گرنگ. هەژارنو ورووژاندنی ناوازە لای مرۆڤ بەرجەستە ناکەن، تاوەکو بتوانرێت بابەتێکی نوێ یاخود داهێنانێکی نوێی وەک هەندێک بابەتو کەرەسەی مادی دەگمەنی لێ پەیدابیێت. لە ئاستێکی کەمو بە هەوڵی زیرەکانە نەبێت.

داهێنان خەسڵەتێکی بەدەست هێنراوە دەرەنجامی مامەڵەی سەرکەوتوانەو گرنگیدان بە توانای مرۆڤ خۆیەوە خەملیوە. تێڕوانینی بەرفراوانی تایبەتمەندانە لە هەموو کارێکی بیری مرۆڤدا ئەگەری ڕوودانی داهێنانی تێدا مسۆگەرە. ئەم پرۆسەیە لە ڕێگای هەوڵدانو خۆ ماندوکردنی بابەتیو خۆییەوە بەرجەستە ئەبێت. ئەو هەوڵانە ئەبنە فاکتەری ئاوێتە بوونو ئاڵوگۆڕی توانای ئەکتیڤ بوونی زیاتری مۆخو لەگەڵ هەژێنەرەکانی ژینگە مادیو کۆمەڵایەتیەکەدا ئاڵوگۆڕی ڕاستەوخۆیان تیادا ڕوو ئەدات. سۆنگەی ڕۆشنبیریو شارستانی لە کۆمەڵگەدا لەگەڵ بابەتی تایبەتمەندی مرۆڤ هەردووکیان ڕۆڵی سەرەکی تیادا ئەگێڕن (٤٩:٦-٥٩). لێرەوە ئەکرێت بڵێین کرداری داهێنان بریتیە لە دۆزینەوەی پەیوەندیەکی ئاشکرا، یان نهێنی نێوان دوو کەرەسەی مادی، یاخود دوو ڕای بەربڵاو (٦:٥).

نالی بەو ئەزموونو شارەزاییو بەرفراوانیەی بیری خۆی توانیویەتی داهێنانی شیعری شایستەو دەگمەن لە بڵاوترین بابەتو کەرەسەدا بکات. لە دارو بەردو ئەستێرەو ئاوەوە لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیو جوانیو خۆشەویستی دوواوەو بیری خۆیی لە سەر هەڵچنیوون. لە شرۆڤەی ئەم شاکارەی نالیدا

**دەخیلت بم نەخیلی یا ڕوطابی**

**وەها شیرین و ، سینە نەرم و ، دڵ ڕەق !**[(٢٥٢:١٤)]

مامۆستا مەسعود موحەمەد لە کتێبەکەی حاجی قادری کۆییدا ئەڵێت: ((هیچ شاعیرێکی عەرەبیش نەیتوانیووە بەو شێوە باسی خورما بکات)). جگە لە شایستەیی شوبهاندنی بابەتەکەو شرۆڤەکەی مامۆستا مەسعودی نەمر. نالی بەرگێکی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریەکی نوێی عاشقانەی بە بەر خورمادا کردووە. خورمای وەک ڕەواڵەت کردووە بە کرۆکی خۆشەویستیو جوانی مرۆڤو چێژێکی شایستەی کوردانەی بە نەتەوەیەکی دوورە دەستی خورماو دارخورما داوە. کەواتە ئاشکرایە، کە داهێنان دەرەنجامی چەندین چلاکی جۆراوجۆری بیرکردنەوەی هزرمەندانەی مرۆڤە. یەکێک لە بنەما سەرەکیە بەشدارەکانی ئەو چالاکیانە لە کرداری داهێناندا ڕۆشنبیری یاخود شارستانیو گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیە.[(٢٨:١٧)] تەنانەت ڕاستەوخۆ کاریگەری بنەماکانی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بە ژیانی تاکەکەسەوە هەست پێئەکرێت. لە ئەنجامی وروژاندنو ئاوێتە بوونی چمکی گۆڕانکاری بونیادی کۆمەڵایەتیو بەرفراوان بوونی ماریفەتی کۆمەڵایەتی خۆییە، کە سەرچاوەکەی ئاستی ڕۆشنبیری، شارستانی کۆمەڵگەکەیە هەندێ گۆڕانکاری کوتوپڕی وەک تورە بوون، زەم کردن، پیاهەڵدان، نالەباری، وەک بەیەکا هەڵشاخانو شەڕ کردنو پەلاماردان بۆ بەرگرتن یاخود لەمپەری تەنینەوە پێ ئەگەیەنێت، کە بە پێی ئاستی کرداری گۆڕانکاریەکەو پلەی ڕۆشنبیریو شارستانی کۆمەڵگە جۆرێک داهێنان خۆی تیادا دەرئەخات، کە ئەوەش بۆ هاوسەنگیو بەرگریو مانەوەو جموجۆڵی گۆڕانکاری مرۆڤایەتیە. لەو گۆڕانکاریەدا کەرەسەو

بابەتی وررووژێنەر بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانی روونبیری دەبنە لینکێکی(حلقة الوصل) گرنگی نێوان تێڕامانو بیرکردنەوە. بە هۆی بنەما سەرەکیە جەستەیی‌و کۆمەڵایەتیەکانەوە تەرزی داهێنانی جۆراوجۆر سەرەتاتکێی دەرکەوتنو تەقینەوە ئەکەن. نموونە لەو بارەیەوە زۆرن. نالەباری پێگەیاندنو توندوتیژی باوان هەستی بیستنی بتهۆڤنی لەناوبرد. نالەباری تێنەگەیشتنی نێوان مامۆستاو خوێندکار ئەدیسۆنی بێ بەشی خوێندن کرد. لێرەوە مرۆڤی داهێنەر ناچار ئەبێت پەنا بۆ کەرەسەو بابەتی مادی یاخود بیری زانستی بە بەها بەرێتو چارەسەرو بەرگری بیروبۆچوونی خۆیی پێ بکات. کەلێنە هزری‌و روونبیریەکانی پڕ بکاتەوە. لە هەمانکاتدا بۆئەوەی رەوتو ئاستی گۆڕانکاریەکە رێک بخرێت هەڵسەنگاندنی بەرامبەر دەست پێ ئەکات. ئەم لایەنە لە روانگەیەکی فەلسەفیەوە دەبێتە فاکتەری دامەزراندنی بوونی بابەتێکی نوێ لە هەمان بابەتدا. واتە بەرجەستە کردنی بابەتێکی نوێیە لەسەر ئەو بنەماو بابەتانەی، کە خۆیان هەن. یاخود ئەوانەی نوێن هەموو بەلاوە بنرێتو بێ دەنگو بێ کردەوە شۆڕەندی رەوشی گۆڕانکاریە سروشتییەکان بێتو ناچار ببێت خۆی بداتە دەست رێکەوتو بابەتی نادیار[١٢].

ئەکرێت بواری داهێنانی نالی لەم سۆنگەیەوە لە شاکارێکی ئەو بەرگری‌و تورە بوونو کاردانەوە نەرموونیانەی بۆ خۆشەویستەکەی رێگا چارەیەک بێتو هەلی ئاشتکردنەوە بدۆزێتەوە.

---

١٢- هەندێ جاریش ئەو ورێژەرانە ئەبنە هۆی لە دەستدانی بیرو شێتبوونوخۆکوشتن، وەک ئێدگار ئالان پۆ بە خاوەن کتێبی رەشو ترسناک ناسرابوو، ئەوەی بە ئەقڵییدا ئەهات ئەیخستە سەرکاغەز، لەدوای مردنی خۆشەویستەکەیەوە دوو ساڵ بەرگەی نەگرتو مرد، یاخود تینیسی ولیمز شانۆکاری بەناوبانگی ئەمریکی پاش مردنی خۆشەویستەکەی‌و خوشکەکەی ئەمیش تامردنی توشی شێتبوونی تەواوەتی هات.

تۆماس ئەدیسۆن ئەلێت:((کەرەسەی داهێنانی مرۆڤایەتی لە کرۆکی کەرەسە سروشتیەکانی دنیادایە)). نالی ئەو کەرەسە سروشتیانەی بە جۆرێک بەکارهێناوە، کە گەورەیی‌و داهێنانی خۆیی تیادا ئەدرەوشێتەوە. بۆ نموونە ئەڵێت:

**شێخی‌یو سەراپا دەڵەک و ڕێوی دەپۆشێ**

**((نالی))م و بە ڕووتی لە هەموو دیدە دەپۆشم.** (٢٨٢:١٤)

یاخود کەرەسەو مرۆڤی گەیاندوەتە کەشکەلانی فەلەک، کە ویستی ئەوەیە بەبێ بێنەو بەرەو خۆ لادان بگەنە خزمەتی یەکترو زانستی نوێ ئاڵوگۆڕ بکەن‌و ئاسودەیی بگۆڕنەوە، لە شاکارەکەدا ئەڵێت:

**زولفت ، کە لە سەر ڕوو بەخەم و تابشە ئەمڕۆ،**

**دودی سییەهی عودە لەسەر عاریضی پشکۆ**

**دەستم کە بە صەد وەعدە لە صەد جێگە شکاوە ،**

**جەبری نییە ئەم کەسەرە هەتا نەیخەیە ئەستۆ**

**خاڵت چییە ؟ دانەی گەنمی جەننەتی ڕووتە**

**چاوت چییە ؟ فیتنەی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ**

**شەو بۆیی سەری سونبولی زولفت لە سەری دام**

**ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ !**

**نەمبیستووە هەرگیز لە دەمت بێنی وەفایێ**

**هەرچەندە سەراپا گوڵی ، ئەمما گوڵی هێرۆ**

**قوربان وەرە با ئەم غەزەلە تازە لەبەرکەین**

**عیزز و شەرەفی ((نالی)) یە تەشریفی قەدی تۆ** (٣٨٧-٣٨٥:١٤)

ئەم سۆنگەیە لەم بەشەدا وابەستەیە بە بەشی پێشتری ئەم باسەوە. لە بەشی پێشوتردا ئاماژەمان بە چەند پێناسەو راڤەیەکی رۆشنبیری، شارستانی کرد، وەک رێوگەیەک بۆ چوونە ناو دنیایی بیر، هەڵسوکەوت، مامەڵە، ئاستی روونبیری، ئەزموونی ژیان، زانست، هونەر، زمانی ئاخاوتنو نووسین، باوەڕو دابو نەریت، رەنگ ...هتد ئەم لایەنانە لەو بوارەدا بەشدارنو کاریگەری خۆیان هەیە. زۆر جار ئەبنە ئاماژەی تایبەتی ناسینەوە بۆ خۆیان، کە ئەم ناسینەوەیە لە ناو خەڵکیدا بە سیمبۆل ناوزەد کراوە. لە پاڵ ئەو سیمبۆلەدا چەندین ئاماژەی وەک ئازادیو یەکسانیو تاکڕەویو تایبەتمەندیو نۆژەن بوونەوەیان بە رێکخستنی کۆمەلایەتی خۆیانەوە لکاندووە، وەک بەشێکی گرنگی بەهای ئەو رۆشنبیری، شارستانیەتە تەماشای ئەکەن. ئەمانە خۆیان لە خۆیاندا جۆرێک داهێنانی پێشکەوتن ئامێزی کۆمەڵگەن، کە لە دەرەنجامی پێداویستیو داخوازی بەردەوام بوونەوە هاتوونەتە کایەوە. لەم روانگەیەوە ئەکرێت رۆشنبیری، شارستانیەت لە کۆمەڵگەی ئۆرگانی پراو پڕی جموجۆڵی مادیو کۆمەلایەتیدا وەک ڤاریابیڵسێکی شوێنکەوتە(متغيير تابع) بە هێزی کۆمەلایەتیەوە ئاماژە پێ بدرێت، کە هەر گۆڕانکارییەک لەو ئاماژانەدا پەیدا بوون، یاخود سەری هەڵدا ئەوە رۆشنبیری، شارستانیەتی کۆمەڵگەکە ئەبێتە شوێنکەوتەی ئەو گۆرانکاریانە. واتە گەشەو پێشکەوتنو گۆڕانکاری لە بەهای ئەو رۆشنبیری، شارستانیەدا ئەبێتە هۆکاری گۆڕانکاری لە رێکخستنە کۆمەلایەتیەکەیاندا. ئەمە هۆکارێکە گۆڕانکاری رۆشنبیری، شارستانیەت لەگەڵ خۆیدا پێ ئەگەیەنێت[٢٧:٢٧]. ئەم لایەنە لە کۆمەڵگەی رەوت میکانیکیدا فاکتەری چەسپاون، سەربەخۆییان سستە، بە پێچەوانەی سۆنگەی یەکەمەوە هێزی

کۆمەڵایەتی میکانیکی لێوان لێوی داب‌و نەریت‌و مۆرس‌و چەسپاوی ئایینی‌و کۆمەڵایەتیە، کە خۆی ئەکات بە سورەی بەر لەشکری گۆڕانکاریە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکان. لە بری بەرەو پێشبردنی پاساوی هێشتنەوەو چەق بەستن‌و پابەند بوونی بۆ ئەهێنێتەوە.

ئەکرێت رۆشنبیری، شارستانی، کە لە ناو ئەو هەموو بابەتە مادی‌و کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵگەو دەرەوەی کۆمەڵگەدا بوونیان هەیە، وەک هێزێکی وروژێنەر بۆ داهێنان تەماشا بکرێن. بابەتی بیری‌و هونەری مرۆڤایەتی بە ترۆپکی گۆڕانکاریەکانەوە وەستاوە. دوو جۆر کاریگەری پۆزەتیڤ‌و نێگەتیڤی هەیە. ئەم کاریگەریە جۆرێک یاخی بوونی پێوە دیارە. چونکە لەگەڵ هەموو ئەو پێشهاتەو گۆڕانکاریانەدا مەرجی پۆزەتیڤ بۆ مرۆڤایەتی ناهێننەکایەوە.

نالی ئەم بابەتەی بە تەواوەتی هەست پێ کردووەو ئەڵێت:

**قاروونە فەلەک ، موستەحەقی گرتن و خەسفە**

**زیو و زەڕی شەمس و قەمەرە ، دیرهەمی کەوکەب**(١٣٥:١٤)

هەموو بەرهەمێکی داهێنەرانە رەگێکی دەماغی هەیە. ئەم رەگە دەماغیە وابەستەی لایەنێکی ناواخنداری گرنگترە، کە بریتیە لە لایەنی کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری.(٥٤:٥)

وەک پێشتر ئاماژەماندا توانای داهینان خەسڵەتێکی بەدەستهێنراوەو لە رێگای هەوڵو ئەزموون‌و ئەنجامی کارلێکی توانایی مۆخی مرۆڤەوە بەرامبەر فاکتەرە ژینگەیی‌و رۆشنبیریەکان یاخود بابەتێکی‌تر بیهاژێنێت.(٢٠١:٢٠) توانای داهێنان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بنەماکەی ئەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی ئاشکرا. ئەگەر مەرجی خۆیی‌و بابەتی لە بوارە کۆمەڵایەتی‌و مادیەکان بۆ دەرکەوتنی کاری داهێنەرانە

بەرجەستە ببن، ئەوە لە زۆر بواری زانستی مرۆڤایەتیدا هەلومەرج بۆ فاکتەری داهێنان بەرجەستە ئەبێت. کاری داهێنەرانە لە سەردەمێکی مێژوویی دیاری کراودا لە ڕەخساندنی هەلی لەباری پێش خۆیەوە دەرئەکەوێت.[(٥٤:١٧)] بۆ نموونە شێوازی مقامە کوردیەکان پێش شیعرەکەی نالی لە ناو کوردەواریدا هەبوون، بەڵام داهێنانەکەی نالی لە ریزبەند کردنو دۆزینەوەی پەیوەنییەکانیاندایە، کە لەگەڵ ئەو هەموو وێنا کردنە شایستەیەدا توانیوویەتی واتای راستەقینە بە لایەنی دیارو نادیار، مادیو کۆمەڵایەتی بدات.

خوێندنەوەی موزیک ئاسای تایبەتمەندانەی لێ دابهێنێت. خەتی نووسینی موزیک وەک پەنجەکانی دەستن (دۆ، رێ، می، فا، سۆ، لا، سی) لە خوێندنەوەی کردارەکەدا پێنج پەنجەی دەست ئەبێتە (می، سۆل، سی، رێ، فا). جگە لەوە نێوانی، یاخود بۆشایی نێوان پەنجەکانیش بە هەمان شێوە ئەخوێنرێنەوەو ئەبن بە (فا، لا، دۆ، می) واتە لایەنە نادیارەکانیش لە زمانی مۆسیقادا دیاری کراوە.

نالی توانیویەتی داهێنەرانە لە ئامێرو ئامێر ژەنو ئاوازەوە بیانجولێنێت، تاوەکو ئەو کاتەی کردویەتیە بونیادی کەلەپورو لە خانەی بەرزی وانەگرتندا (بەیتی مەعمور) ئاماژەی پێداوونو ئەڵێت:

**کە دیتم شکڵی صەد ڕەنگی ، گوتم : بابایی عەییارە**

**کە بیستم لەفظی بێ دەنگی ، گوتم : شیپووری شاپوورە**

**گوتم : ڕاستی صەبا هەڵسە ! گوتی : مەشرەب موخالیفیە**

**گوتم : نارێ ، گوتی : بایە ، گوتم : ئەوجێ گوتی دوورە**

**گوتم : قوربانی تۆ من بم ، گوتی قوربانی تۆ سەگ بێ**

**گوتم : شیشەی دڵم ناتوێ ؟ گوتی : بۆچیمە مەکسوورە**

**خەراباتی دڵی ((نالی)) مەفەرموو : خاڵییە نایەم !**

**بە مەرگی تۆ قەسەم ، چاوم ! بە ذیکرت بەیتی مەعمورە**(٤٠٩:١٤)

لێرەدا ئەتوانین بڵێین لە نێوان بوونو داهێنەردا داهینانەکە خۆیەتی، بەڵام نێوان رایەڵەیەکانی تەون ئاسا زۆر وریایانە تەنراون؛ چونکە زۆر جار کەرەسەی ئەو ئەو تەونانە بەرەنگاری داهێنان ئەبیتەوە، ئەگەر لە راستییە مادی یاخود کۆمەڵایەتیەکەدا پەی پێنەبرابێت. نالی لە شارەزایی داهێنەرانەی خۆیەوەیەتی، کە ئەڵێت:

**ظاهیرو باطن ، لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز**

**ئاشنای سیرڕی قەڵەم بێ ، غەیری ((نالی)) کەس نەما**(١٣١:١٤)

واتە سەرە داوی گرێی هەموو رایەڵەکانی دۆزیوەتەوەو خۆی ئەزانێت مامەڵەیان لەگەڵدا بکات. هەر هەولێکیش بۆ شێواندنی کەڵک ناگرێت ئەوەتا خۆی بە دڵنیاییەوە ئەڵێت:

**ئەو گەوهەرە نوکتە ، کە لە ((نالی)) دەدزن خەڵق**

**ئاوی نییە ، وەک ئاگری بێ شەوقی دزانە**(٤٨١:١٤)

نالی لە شیعرەکانیدا هەستو سۆزو وروژانێکی مرۆڤانەی کردۆتە هەوێنی شیعرەکانیو لەو راستیو خەیاڵە بەرفراوانەیەوە، بە ئاشکرا کاریگەری لەسەر بیرو بیرکردنەوەی ئەم مەزنە کردووە. توانیویەتی سنوری بیرکردنەوەی باوی پێ ببەزێنێتو واتای خۆشەوسیتی وڵاتو سیاسەتو کوردو زمانو عەشقی راسەقینەی مرۆڤانە ئاشکرا بکات. بە شێوەیەک، کە لە رووخسارو جەستە

دەرئەچن‌و بەرەو کەماڵی دڵ ڕێ ئەگرن.  بۆ نموونە ئاشکرایە،نالی چێژ لە لێوەکانەوە دەرباز ئەکات بەرەو زمان‌و دەم، تاوەکو ئەگەیەنێتە ناو دڵ‌و خودی دڵ خۆی لە بری دەم‌و زمان تامی ئەکات. ئا لێرەدا کام هێز هەیە بتوانێت ئەو چێژە مەعنەویە، وەک نالی مەبەستێتی لە دڵدا ئاشکرا بکات؟ وەک چۆن نالی ئەڵێت:

**بەو شەهدی کەلامەت ، کە بە ئیشرابی لەطافەت**

**لەذذەت دەگەیەنی بە دڵ و ذیهنی موخاطەب**[١٣٤:١٤]

هەرچەندە مامۆستا مەسعود موحەمەد لەو باوەڕەدایە وشەی (ذیهن) (دەهن) بێت واتە جەستە. پێ ئەچێت ئەم بۆچوونە ڕاستتر بێت[١٣].

لە شیعرو هونەری کوردیدا نموونەی بەرزو داهێنانی دانسکە زۆرن، کە لە نێویاندا تاوەکو ئەمڕۆ نالی بە ئاسمانی ئەو داهێنانەی شیعری کوردیەوە دیارە. نالی بە ڕاستی هەوڵیداوە ژیانی کۆمەلایەتی‌و مرۆڤ پێکەوە بپشکنێ، تاوەکو مرۆڤ بتوانێت بە کردەوە خۆی لە ڕەواڵەت پاکتاو بکات. ڕێی لادان‌و خۆ برانەوە نەگرێت‌و سەرلێشێواو نەبێت.

ڕاستی لێک گەیشتن‌و خۆگونجاندن بۆ ئەو سەردەمەو ئێستاکەش ئاشکرایە. داهێنانی لایەنە مادیەکان  زووتر لە لایەنە مرۆڤایەتیەکان دەرئەکەون. ئەوەتا چەندین کەلێن‌و بۆشاییی هەن، کە ئەبێت لەو ئاستەوە هاریکارو ڕێگە خۆشکارو پڕکەرەوە بن‌و ببنە زادەی سیاسەتێکی کۆمەلایەتی مرۆڤ دۆستانە.

بەو شێوەیە نالی ویستویەتی زۆر کەلێن‌و بۆشایی بیرو ڕۆشنبیریی ڕۆشنبیری‌و شارستانیەتمان بۆ پڕبکاتەوە. بە دڵنیاییەوە توانایی ئەم مەزنە، تاوەکو ڕادەیەکی

---

١٣ـ بڕوانە مەسعود موحەمەد ، حاجی قادری کۆیی بەشی دووەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧

زۆر بێ ویقاریو بێ کەمو کورتیی پێوە دیارە. ئەوەشی لە خودی خەڵکو وڵاتەکەیەوە هەڵقوڵاندووە. پێشتر کەس پەی پێ نەبردووە. بیر لە پێویستیەکی وەک ئەوەی نالی نەکراوەتەوە، کە چارەسەری کەلێنو بۆشاییەکان بکات. هەر لە سەرەتاوە هەستی بەو لێپرسراویەتیە کردووەو هەوڵیداوە گورز وەشێنی رۆستەمی دەوروبەر بێت. لە یەکێک لە بەیتە شیعریەکانیدا ئەڵێت:

**نالیا بێ هیممەتی تاکەی بە دەست میحنەتتەوە**

**فاتیحیو رۆستەم ئاسا ، صاحیبی تیغ و عەلەم**(٣١١:١٤)

تاوەکو دڵسۆزان چاوی لێ بکەنو دیدی خودی مرۆڤی کورد لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدا بگۆڕێتو بەهاو نەریتی کۆمەڵایەتی نوێو پەسەندو فەرهەنگی بەسود بۆ خۆیو بۆ نەوەکانی دوای خۆی بهێنێتە کایەوە.

ئەم بابەتانەی نالی باسی کردوون خۆ بە خۆ نەنوسراون خەڵک هەبووە تێیان بگاتو هەڵیان سەنگێنێت. هەر بۆیە شێوازی نوێی لە نووسیندا بەکارهێناوەو کردوونیەتە بەردی بناغەی شێوازێکی نوێتر.

ئەو خەڵکە چی لە خەڵکی دەروردراوسێ کەمترە؟ بگرە خزمەتی چاکی ئەوانیشیان کردووە. ئیتر ئەم مەزنە (نالی) ئەو بوارەی وشک کردەوە. مەبەستی بوو نوزەی لێ ببرێت[١٤]. ئەو هەموو ئاڵو والاییە پانو پۆڕو تانو پۆ چڕانەی نالی، کە وەک شاکار لە بەردەستی ئێمەدان بە داهێنانێکی بیری سەردەمێکی دیاری کراوەوە بەستراوە. ئەکرێت گەشەی بەرچاویان پێ بدرێت.

---

١٤- ئێستاش مرۆڤی کورد چی لە مرۆڤی سەردەم کەمترە؟ بێگومان ئەگەر گەورەتر نەبێت ئەوە کەمتر نیە. بەڵام بەگەڕخستنی تواناکانی ماوە بە خاوەن بوونو بەخۆدا چوونەوەی ماوە ئەوەش بۆ نەتەوەیەکی وەک کورد هەرچەند پشو درێژی وشەونوخونی ئەوێت بەڵام ئەتوانێت لە بەری ڕەنجی خۆی بخوات.

لایەنێکیتری داهێنان لای نالی لە بواری تێر کردنی پێویستیەکانیدا بووە. چونکە ئەگەر تێر بوون مەرەخەس کردن بێتو لایەکت لێ نەکاتەوە بە لایەنی کەمەوە وەڵامدانەوەی پێداویستیە فەسلەژیو کۆمەڵایەتیەکان نەبێت. هەستی راستەقینەت پێ نەبەخشێ، ئەوە ناچار پێداویستیەکان خۆیان بەملاولای هەندێ چالاکی تردا هەڵئەسپێرن.

رادەی بیرو بنەمای پەروەردەو گەشەی تواناکانی هزرو ئاستی پلەو پێگەی کۆمەڵایەتی کاریگەری بەرچاویان هەیە. لەوانەشە ببێتە مایەی داهێنان. چونکە هەر شێوازێک مادی، یاخود مرۆڤایەتی بێت، ئەوە بابەتی راستەقینە هەڵئەبژێرێو لە داهێنانەکانیدا خۆی نادات بە دەست خەیاڵەوە. بۆ ئەوەی نالی خۆی لەو لایەنەوە نەگلێنێت بنەی بوونی لێ ون نەبێت، ئەوە لەو شێوە هۆنینەوانە دوورکەوتۆتەوە، تاوەکو خەڵکی ئەو تۆمەتەی نەدەنە پاڵ. بە ئاشکرا لە یەکێ لە شاکارەکانیدا ئەڵێت:

**گەر خەیاڵی دەهەنی بهێنمە نێو ئەم غەزەلە**

**دێن دەڵێن ئەم غەزەلە وردە خەیاڵێکی هەیە !**(٥٧١:١٤)

کەواتە دوورکەوتنەوە لە هۆنینەوەی سەرسورهێنەری سەرقاڵ کاری بێ سوود خەسڵەتێکی ئەم مەزنە مرۆڤەی کورد بووە. لە هەر کارێکی خەیاڵیشدا هەوڵیداوە بە بنەمای راستیە مادیو مرۆڤایەتیەکانەوەی بلکێنێتو پێودانگیان بکات، چونکە ئاشکراو دیارە، کە بنەمای تایبەتمەندی لە داهێنانێکی کۆمەڵایەتیدا لە مێژووی پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکانەوە سەرچاوە ئەگرێت. ئەو کاتانەی مەرجە خۆییو بابەتییەکان بە گەشەی پەیوەندییەکانەوە وابەستە ئەبن هەل بۆ ئەو کارە ئەڕەخسێنێتو بنەمای داهێنانی پێوە پابەند ئەکات. لە ئاستی زانستی مرۆڤدا لە

وشە ئارایی‌و جوان سازییەوە ئەکەوێتە وێزەی ئەو تێر بوونە فەسلەژی‌و کۆمەڵایەتیانەی بۆی گەڕاوەو بە ناچار شۆڕەندیان بووە، لە یەکێک لە بەرزە شیعرەکانیدا ئەڵێت:

**دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە ، جەوابی نادەم**

**مودەتێکە لە قەفەزدایە ، عەذابی نادەم**

**مەجلیسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گوڵ و موڵ**

**بە دوو صەد مەدرەسەو دەرس و کیتابی نادەم**

**گوتم : ئەی ماە دڵی من بە دڵی خۆت بکرە !**

**گوتی : بەردی بەقیمەت بە کەبابی نادەم**

**گۆشە گیرم بە ئەبرۆت و ، متەوەححیش لە موژەت**

**ڕۆحی شیرینم لەبەر شیر و قولابی نادەم**

**طەلەبی سینەیی چاکم مەکە بەو چاوانە**

**سینەکەم چاکە و بە ئینسانی خەرابی نادەم**

**((نالیا)) ئەم غەزەلەت تازە بە تازە وتووە**

**بە دووصەد (مەثنەوی) یو (لوببی لوباب) ی نادەم.**(١٤: ٣٠٥- ٣٠٨)

تاوەکو ئێستا بواری داهێنان لای نالی هەر لە باسولێکۆڵینەوەی ریلاتیڤدایە[١٥]. تێروانینێک لە خەوەکەی مەستورە چ داهێنانێکی مەزنی بۆ ئەو سەردەمە تێدایە.

---

**١٥- مامۆستا مەسعود محەمەد دەڵێت : نالی زۆر پێش سارتەر وەک لە رۆمانی پەرژینی سیحرچین ئەم دەستەواژەیەی وتوە**

**دەست بەندیانە دێن و دەچن سەوزو نارەوەرن**

**یا حەڵقیانە سۆفی مل خوارو مەندە بوور**

پاشان لەو ئامۆژگاریو ئاگاداریو پەروەردەو پەردە لادانو خۆ دزینەوەی مافە سروشتیانە وردبینەوە، میتۆدەکەی لە تەرزی دەرکەوتنە کۆمەڵایەتیەکەی جیاواز ترە. داهێنانی تەواوەتی تیادا دەرخستووە بەوەی دەبێت بۆ مەبەست بگەڕێیت نەک مەبەست لە تۆ بگەڕێت.

کردارە سێکسیەکان لای نالی وەک گۆڕانێکاریەکی زانستی شێوازی شیعری تیادا داهێناون. ئاماژەی دیاری بە رەوشێکی هەست پێکراوی رەمەکی کردووە. هەر لە سەردەمی ئادەمو حەواوە، لە رووی ئایینەوە، لە دروست بوونی بوونەوەری سەر زەویەوە، لە رێگەی بۆچوونەکانی داروینەوە تاوەکو ئەم سەدەمەو بۆ لەمەودواییش کرداری سێکسی هەیەو بریتیە لە کرداری بەردەوام بوونی ژیان. دیارە باسکردن لەو بوارە بە بەراوردی لەگەڵ گەشەو پێشکەوتنو گۆڕانکاریە مادیو کۆمەڵایەتیەکانی سەردەمە مێژوییەکاندا، لە فەرهەنگی هەموو کۆمەڵگایەکدا ئەگۆڕێت[١٦]، کە بۆ ئەو سەردەمەش ئەو شێوازە بە پەسەندترین شێوازی راڤە

سارتەر دەنووسێت: 'وکان الخضراء حركة كبيرة مستمرة أم موجة البحر تتجمد عن إندثارها

١٦- باخۆفن لە کتێبی مافی دایکدا بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی سێ سەردەمو قۆناغی دژایەتیو کێبەرکێی سێکسی داناوەو بەستویەتیەوە بە دەسەڵاتەوە یەکەمیان سەردەمی گەڕەلاوژییە (فوضی) ناسراوە بە سەردەمی دەسەڵاتی مادەی رەها، بەو پێیەی مادەیی رەها بە هێزی بیرکردنەوەوە وابەستە دەبێتو بەشێکە لێی، پەیوەندی نێوان مادەو بیر وەک پەیوەندی زەویو ئاو وایە. ئاو بەشێکە لە زەوی، زەوی پێشوازی دەکات، بونەوەرو بابەتی لێئەهێنێتە ژیانەوەو لەپاش مردن بۆی ئەگێڕێتەوە، ئەم سەردەمە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئاماژەیەکە بە بیری دایکایەتی، باخۆفن بە سەردەمی سروشتی یاخود پرۆنۆگرافی (الاباحية الجنسية PRONOGRAPHY) ی ناوزەندکردووە. سەردەمی دووەم، دەسەڵاتی ئەروای (رۆحی) دایکە، سەردەمی زەوی خاوە (الارض الخام) بە رێکخستنی پەیوەندی سێکسی ناساندووەو لەم سەردەمەدا رەچەڵەک گەڕاوەتەوە بۆ دایک، ئاماژەی بە قۆناغی پرۆنۆگرافی بۆ قۆناغی دەستبەندی داوە ، وابەستەیە بە پەیدابوونی ئایینەوە، سەردەمی پەیدابوونی داستانو فابێلە ئەو سەردەمەیە، کە هێزی پیاو گەڕاوەتەوە بۆ مانگ، مانگ لە نێوان زەوی خۆردا ئەوەستێت بەپێی یاسا سروشتیەکان، هیچ یاسایەک ئەم رەوشەی بۆ ناگۆڕڕێ، مۆرکی ئایینی لەم سەردەمەدا پەرستنی مانگ بووە. سەردەمی سێیەم، دەسەڵاتی فکری باوک بووە، ئەم سەردەمەی بە بەرزترین سەردەمی گەشەی مێژووی شارستانی داناوە، قۆناغی گەڕانەوەی رەچەڵەکە بۆ باوک، لە باوەڕی

کردنی سێکس لە کۆمەڵگەیەکی داخراو لە پێگەیەکی جوگرافیای دیاری کراوی خاوەن دەریایەک دابو نەریتو پەیوەندی میکانیکیو بەڕێوەبردنی ژیانی پەرژیک ئاسا دائەنرێ. نالی زانیویەتی دژایەتیو کێبەرکێیەکی مادیو کۆمەڵایەتی لە کایەدا هەیە، لەو ڕێگەیەوە مێژوو بەردەوام ئەبێت. بە لایەنی پێگەیشتنی کردارە سێکسیەکانەوە بەوردی ئەو دژایەتیو کێبەڕکێ مێژووییە دوو توێیەی لە شیعرێکی پێنج بەیتیدا ئاماژە پێداوە ئەڵێت:

**ئیلتیقای پۆلا و ئاسن هەر نیزاعە و گیرو دار**

**جەمعی ماء و نار و زەند و زەندەو و مەرخ و عەفار**

**ئەم لەسەر تەعظیم و گەورە گرتنی ئەو بێ قوصور**

**ئەو لە سەر تەحقیر و تەخفیف و شکستی زاری مار**

**ئەم بچێ ئەو دائەنیشێ دەم وەکو گوڵ خەندەران**

**ئەم دەبێ هەستێ، کە ئەو بێ، چاویەک و قەطرە هەزار**

**ئەم بە چاو دوڕپو بەسەر لەعلی هەدیییەی بۆ دەبا**

**ئەو بەتف دەیکا بە میزابی شکستەی ئابشار**

**نەظمی ((نالی)) میثلی ئاو و ئاوێنە ڕەنگی نییە**

**دوو ڕووە بۆ سەیری خاطر: یەک خەفی و یەک ئاشکار.**(١٤: ١٧٠ – ١٧٤)

---

پەرستنی مانگەوە سیستەمی ئەستێرە (کواکب) هاتەکایەوە، ئەم سەردەمە پاش بڵاوبوونەوەی کشتوکاڵ پەرەی سەند. یەکەمین شۆرشی مرۆڤ بوو بەسەر سروشتدا، پاشان خانمان کشتوکاڵیان تیادا دۆزیەوە. واتە یاسایەک پەیدابوو بۆ رێکخستن، چونکە ژیانی کشتوکاڵی پێویستی بە ریکخسنو خیزان هەیە بە شێوەیەک هەڵگەڕایەوە، کە لە بری ئەوەی زەوی پێگەی خانمانی هەبێت، خانمان بوون بە لاساییکاری زەوی. ئالێرەوە بە هەموو گیروگارەی نالی مەزن باسی دەکات ئەوجا توانراوە لەو سەردەمەدا لە کۆمەڵگایەکی داخراوی میکانیکیدا بتوانێت ئەو باسە بەو شێوە داهێنانەرانەیە بخاتە روو.

ئەم داهێنانەی نالی جگە لە بەردەوامی ئەو مێژووە راستیەکن‌و ئەلکێن بە دیدی راستەوخۆی تەمەن‌و باوەڕیشت پێ ئەهێنن، کە چالاکی سێکسی لای مرۆڤ هەیەو بزەو چێژی خۆشی، یان موچڕکەی هەستیار بە لەشدا دێنێت. بەو شێوازەی چاو پۆشی‌و شاردنەوەی نییەو ئەبێت ببێتە راستیەکی ژیان.

لە خەوەکەی مەستورەدا چەندین بابەتی تێکەڵاوی ئەو لایەنەی تیادا بەدی ئەکرێت. هەر لە سەرەتادا واتایەکی‌تر لە واتا گرنگەکانی‌تری خەو بینین ئەشکرا ئەکات. چونکە خەوبینین چەندین واژەی هەیە. چەندین راوبۆچوونی جیاواز لەسەر تاکە خەوێک هەیە. ئەم خەوەی نالی خەوێکەو دەیان رووداوی وابەستەی تێدایە. هەمواری خەو بۆ ئەو سەردەمەو ئێستا جیاوازن. هەرچەند بنەماکانی لەو سەردەمە پێشتریشدا داڕێژراوون کەچی خەوەکەی نالی خستیە سەر کاغەز بووبە هاتوو هاوار. ناچمە درێژەپێدانی، هەرچەندە هەمیشە وابووە خەو ئەگێڕێتەوە نانوسرێتەوە لەوێوە داهێنانەکە لای ئەم مەزنە دەرئەکەوێت.

لەبەر رەچاوکردنی بەهاو نەریت هەندێ بابەتی لاوەکی ئاسایی نەبووە، کە ئاشکرایە ئەگەر وابمایایەتەوە واتاکان ئەکەوتنە قۆزاخەوەو پێداویستیەکان ئەبوونە خەفەو ئازاراوی ئەبوون. ئەوکاتە مەبەست لە مرڤ ئەگەڕاو مرۆڤ ئەبووە ئامێری کرداری سێکی‌و بەرگە کۆمەڵایەتیەکەی لێ دائەماڵرا.

ئاستی بیرو رادەی روونبیری‌و پلەو پێگەی کۆمەڵایەتی‌و شێوازی بۆچوونەکانی ژیان خۆی چۆنیەتی خەوبینین دیاری ئەکات. شاعیر هیچ کاتێک لە ئاسمانەوە وشەی بۆ ناباریێ ئەگەر واقیعی کۆمەڵایەتی پەی بە هەستی نەبات. بە هەمان شێوە

ئەمیش پەی بەو راستییە کۆمەڵایەتیە نابات ئەگەر بیرو هزری خۆی بەردەوام بەرفراوان نەکات.

لێرەدا نموونەیەک ئەهێنمەوە جارێک پیاوێکی راکردووی سیاسی خەو ئەبینێت بێ ئەوەی لویسی فەرەنسای بینیبێت، یاخود لەو سەردەمەدا ژیابێت. شەو لە خەویا لە فەرەنسایەو لەسەر سیاسەت سزای سەر پەڕاندنی بۆ دەرچووەو مقصلەیان (گیۆتین) بۆ داناوە. لەو کاتەدا، کە رادەکشێتو خەریکی ئەوەن لە ملی بدەن بە داچڵەکینەوە خەبەری ئەبێتەوە. سەیر ئەکات تاڵێکی پەتی جاجمەکەی شلەو کەوتۆتە سەرملی. باشە ئەگەر کابرا هەڵاتووی سیاسەت نەبوایە ئەوە تاڵەکە نە ئەبوو بە مێشولە؟

جا کرداری خەوەکەی نالی سەیر بکە کێ هەیە نەزانێت. بەڵام هەر کەسێک لە دیدو روانگەی بیری خۆیەوە سەیری ئەکات، وەک تابلۆی کیژۆڵەیەکی بێبەرگ وایە هەرزەکارێک جیاو دوکاندارێکی ناو بازاڕ جیاو مەلایەکو سۆفیەک دیدێکی جیایان بۆ راڤەکردنی تابلۆکە هەیە. بەڵام تابلۆکێشێک لە هونەرەکە ئەڕوانێت. کامیان ئەتوانن جوانی تابلۆکە دەربڕنو واتا هونەریەکانی راڤە بکەن؟

ئەو کاتانەی لە خەودا، کە کۆئەندامی دەمار ئەچێتە باری دامرکاندنەوە تەنها خاڵی پاسەوان بە ئاگایەو لە هەر جێگەیەک لە مۆخدا ورووژانێک دروستبێت، ئەوا ئەم بە پەلە ئەگاتە سەریو لە شێوەی فلیمێکی شیاوی ژیانی خۆی (مرۆڤە نوستووەکە) دێتە پێش چاوی.[١٦٣:٦] لە لای ئیسلامدا شێوەکانی لێکدانەوەی خەو زۆری لەگەڵ ئەم شێوازە جیاوازە یا زۆر دوور نەکەومەوە ئەمەش جۆرێکە لە داهێنان.

**تەحریری خەیاڵ و خەو ئەگەر بێتە حیسابێ**

**دەروێش و گەدا شاه و دەبێ شاه گەدا بێ** (١٤: ٦٢٩)

جا ئەگەر ئەو بتوانێ ئەو خەوە وەک خۆی بەو شێوازە گونجاوە بخاتە بەرچاوی ئێمەو هەموو ئەو وێنە راستیانەی بداتێ لەوانەیە سەر سورهێنەر نەبێت ئەگەر بڵێین نالی لە کامێرای سەفاگاهی نەزەرگەیەوە جوانترین وێنەمان(١٧) بۆ بگرێت داهێنانی تیادا بدۆزینەوە. لە شیعرێکدا ئەو توانایە لای نالی ئاشکرا ئەبێتو ئەڵێت:

**بۆ مەشقی عیشقی زوڵفی نیگار و نیگارشی**

**((نالی)) لەخامەدا بۆتە شاهی طورڕە نووس** (١٤: ٢٤٠)

جگە لە خەوەکە لەو کاتە وردبەرەوە، کە بادی خۆش مروور ئەنێرێتو ئەیگەیەنێتە سەرچنار وەک کامێرایەکی دیجیتاڵی ئەم سەردەمە وێنەی گرتووەو ئەڵێت:

**ئەمجا مەوەستە تادەگەییە عەینی (سەرچنار)**

**ئاوێکە پڕلە نار و چنار و گوڵ و چنور**

**چەشمێکە کە میثلی خۆر ، کە لە سەد جێ بەرۆشنی**

**فەوورانی تۆری صافە لە سەر بەردی وەک بلور**

**یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا**

**ئەستێرەکانی رابکشێن وەک شیهابی نور** (١٤: ١٧٨-١٧٩)

یاخود چ تەرازویەک هەیە بتوانێت هەتا ژیان بەردوام بێت ئەو خەریکی کێشانی رۆحو خۆشەویستی بێت، کە نە کۆن ببێتو نە بسوێتو نە بەسەربچێت؟

---

١٧- ئەمڕۆ وێنە بۆتە بنەمایەکی هەستو نەستو بەڵگەیی وا، کە ئەتوانێت بەرەورووی یاساکانی سەردەممان بکاتەوە.

## زوڵفی دوو تایی کەتەرازوو مەثەلی دڵکێشت

**ڕۆح دەکێشن بە دوو سەر ، ئەم بە سەرێ ، ئەو بە سەرێ**(٦٥١:١٤)

ئاشکرا کردنی کرۆکی مەبەست لە هەموو بوارێکی هونەرە جوانەکەندا بەتایبەتی لە شیعردا کارێکی تا بڵێی ئاڵۆزو بێزراوە، چونکە سروشتی هونەر هەموو پابەند بوونو سنوورێک بەلاوە ئەنێت، هەر ئەمەشە وایکردووە بە وردەکارییەکی داهێنەرانەوە لە دەقێکی نووسراو یاخود تابلۆیەک سەرنج بدەین، یاخود لە هونەردا بۆچوونو تێڕوانینو باسکردنەکان جیاوازبن. چەند راکان جیاوازبن مانای وایە ئەوەندە داهێنانەکە سەرکەوتوو بووە. لە مێژووی مرۆڤایەتیدا زۆر بیرمەندو هونەرمەند کاری ناوازەو سەرسوڕهێنەریان کردووە. لە راڤە کردنێکدا یاخود لە بینینێکدا لەوانەیە جوانترین واتاو مەبەستی سەردەمێکی مێژوویی پێ بەخشرابێت، وەک داهێنان ناوی دەرکردبێت.

یەکێک لەو شاکارانەی نالی، کە ئەکەوێتە ترۆپکی داهێنانەکانیەوە، چونکە لە کاتی خوێندنەوەو بیرکردنەوەیدا ئەبنە هەستێک بەرەو لای هەموو جوانیو هونەرێک کێشمان ئەکات، لەگەڵ تێڕوانینو تێگەیشتن لەو رەوشە هەستیەوە ئەوجا کاریگەریی توانایی جوانیو سروشتو خۆشەوستی ئاسوودەیی ئەبەخشنەوە. ئەمە واتای ئەو داهێنانەیە، کە بابەتێک لە دنیای تێڕوانینی دروستدا بەرجەستە بوو بێت. خوێندنەوەی وردو وشیارانە دیارە نووسەری وشیارت پێ ئەناسێنێ.

زمانی ئەم پارچە شیعرە، کە لە پاشاندا ئاماژەی پێ ئەدەم پڕە لە جموجۆڵو رەنگ. ئەو شێوازەی پێی نووسراوە باوەڕی بە هیچ پابەند بوونو سنوورێک نەبووە، تاوەکو نەبێتە رێگر بۆ بەدواداچوون.

نالی لە پاڵ ئەم راستیەدا چمکێکی وشە ئاراییی گرتووەو ئاماژەی ئاوازو وێنەو ئەزموونی تێدا پەخش کردووە. بە جوانیەکی بێ هاوتای هونەری جوانناسی ئەمانخاتە سەر ئەزموونێکی گەورە لە دەریای خۆشەویستیو چاو بازیو بێنەو بەرەی دڵداریو ...هتد. با پێکەوە لەم دەقە پڕ داهێنەرانەیە بڕوانین:

**کەوا زەرتایی یەک تایی دەڵێی خورشیدی ئافاقە**

**مەڵی خورشیدی ئافاقە ، بڵێ میهرێ کەوا تاقە**

**ڕەیاحین پەرچەم و ، لالە کولاە و ، یاسەمین طوڕڕە**

**بەنەفشە خاڵ و ، نەرگز چاو و ، گوڵ زار و سەمەن ساقە**

**بنازم دولبەری خۆم چەندە پڕ وەصف و چ بێ عەیبە:**

**بە چاو مەست و ، بە دڵ هۆشیار ، بە ئەبرۆ جوت و هەم تاقە !**

**نەوای ئاهەنگی (قد قامت) طەریقی جەمعی زوههادە**

**قەد و قامەت بە لەهجەی ڕاستی طووبایی عوششاقە**

**بە زولفی تۆیە وابەستە ، لە من دڵ گەر پەرێشانە**

**بە ئەبرۆی تۆیە پەیوەستە ، ئەگەر طاقەت لەمن تاقە**

**بە نەهری کەوثەر و شیر و عەسەل چەند تینووە صۆفی**

**لەبی ((نالی)) دوو چەندان بۆ لەبانی لەعلی موشتاقە.**(١٤: ٤٥٥-٤٥٧)

ئەگەر کەسێکی هونەرمەند بتوانێت بیکاتە تابلۆ با بفەرموێت، هەتا ئێستا بەم بێ دەنگیە لە چێژی چاو تێبیرینەکەی دافینشی بۆ مۆنالیزا کەمتری تیادا نابینرێتەوە. ئەمەندە شارەزاو داهێنەرە بە ئاوی بێرەنگ ئەم تابلۆی وشەو جوانیەمان بۆ ئەکێشێتو ئەڵێت:

**وا ظەن مەبە ڕوخسارەیی تۆ غائیبە قوربان**

**بنوارە چلۆن نەقشە لە دیدەیی تەڕما.**(١٢١:١٤)

نەخشو نیگار بە ئاو ئەسڕێتەوە کەچی ئەم واتای ژیانو دروست بوونی ئەداتێ ئەمە ئیشارەتە ڕەواڵەتیەکەیەتی. بەڵام ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە شۆڕەند بوون بەو لایەنە مادیەی، کە ژیانی لەسەرپێکهاتووە. ئەوکاتەیە، کە هەستی بە نەمری بەردەوامی خۆی کردووە کاتی دڵنیایی بووە، کە نهێنیەکەی دۆزیوەتەوەو ئەزانێت لە هەموو وەرزێکی سەردەمە جیاوازەکاندا وەک خاکو ئاو بوونی خۆی سەلماندووەو ئەڵێت:

**لێوی تۆ ئاوی بەقا ، من خضرم**

**فەیضی تۆ ڕەحمەت و من سەوزە گیا**(١٢٥:١٤)

نالی وا بە قووڵی بە واتاکاندا شۆڕبۆتەوە ئەرستۆ ئاسا ئاوی بە مادەی یەکەمو کرۆکی هەموو شتێک داناوە. کە چۆن ڕووەکو ئاژەڵ لە شێ خۆراک وەرئەگرنو بنەمای شێ بریتیە لە ئاو. خۆڵو خاک لە ئاو پەیدا ئەبن، کە چین بە چین لەسەریەک کەڵەکە ئەبنو ئەبنە سەوزاییو وشکایی. وەک ئەرستۆ بەم شێوە بیرکردنەوەیە لە ژیانی مادیو کۆمەڵایەتی ڕوانیووە، تاوەکو ئەو کاتەی لە ناو ئەم دەریاو ئۆقیانووسانەدا پێکهاتەی غازی دروست بووەو چەندین ناوچەی لە ئاو هەژار کردووە.

چەندو بە کام شێواز لە شیعرەکانی نالی بکۆڵیتەوەو هەڵیگێڕیتەوەو بهێنیتو ببەیت واتاکانی جوانتر ئەبنو مەبەستی جوانتری تیادا دەرئەکەون. ئەوەتا لە شاکارێکی پڕ واتای ئەزموونیدا ئەڵێت:

ڕەوغەنی دیدەم ڕژایە سەرکیتابی خەططی خۆم

چاو لە ئێشی ئەو سپی ، نووریش بەسەر ئەودا سەقەط (٢٤٤:١٤)

ئەمانباتەوە بۆ کۆتایی کتێبی "**هکذا تکلم زرادشت**"[١٨]. ئەمەش تەنها بۆ برەودانی توانا مرۆڤایەتیەکانی خودی مرۆڤ خۆیەتی، چونکە شتێک نییە لەم دنیایەدا لە هەر ڕوویەکی مادی یان کۆمەلایەتیەوە لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ نەبێت. هەندێکیان دەبنە هۆی چێژ وەرگرتنی هەست، کە زۆر جار هەوای گۆڕانکاری دەماری هەستو خەیاڵ رائەچڵەکێنێتو ئەڵێیت: نالی چیی وت؟ ئەوە خۆی لە خۆیدا هەنگاوی داهێنانە. ئەمەش پەیوەندیەکی ئاڵۆزکراوی نێوان داهێنەر خۆیو ژیانو ئەزموونی هزری بیرکردنەوەیەتی، هەمووی لە چەند وشەیەک یان فلچەیەک یان کارێک کورت ئەکاتەوەو واتای گەورەو خزمەتی گەورەی مرۆڤایەتی پێ ئەکاتو کەلەپوورو مێژووی مرۆڤایەتی پێ دەوڵەمەند ئەکات(٣٠:٧).

زۆر جار نالی وەک هەر داهێنەرێکیتری دنیا بۆ بەشوێندا گەڕانو دەرخستنی دەسەلاتی خۆی بە شێوازێکی تەمومژاوی لەسەر سروشتو کۆمەڵگە بیری خۆیی ناساندووە، بۆیە هەرچییەکی گوتووە هاوکێشەی داڕێژە بیرێژە ئەوجا بیبێژەی بە باشی پەیرەو کردووە. ئەڵێت:

---

١٨- ڕۆمانی (هکذا تکلم زرادشت) نووسەرو فەیلەسوفی بەناوبانگ (فردیک نتشه١٨٤٤-١٩٠٠) نوسییوویەتی. لە چوار بەرگدا لە ساڵی ١٨٨٣-١٨٨٥ بلاوکراونەتەوە. لە کۆمەڵێک وتاری فەلسەفییانەی ئاینی زەردەشتی پێکهاتووە. ئەم کتێبەی نیتشە لە بەناوبانگترین کتێبیتی، کە بە ئاوازێکی مۆسیقیو شیعریو داڕشتن لە شێوازێکی ئەدەبی ڕەخنەگرانەی بەرزدا بۆچوونەکانی نیتشەی بەرامبەر بە گەورەیی ئیرادەی مرۆڤ تیادا دڕشتووە.

**دەورانییە ، وەک هێڵەکی سەودا ، سەری گێژم**

**بۆیە بەدەقیقی مەثەلە هەرچی دەبێژم** (٢٧٦:١٤)

ئەو بۆچوونە راستە، ئەو بەشە دەماریانەی ئەکەونە ژێر توێکی مۆخەوە بە بەراورد بە مۆخو توێکی مۆخ خۆی، لە ئاستێکی گەشە کردووی زیاتردان لە چاو خانە دەماریەکانی‌تردا، (١٤٨:١). بە واتایەکی‌تر خانە دەمارەکانی بەشی پشتەوەی نێوەندە کۆئەندامی دەمار ریژەکەیان زیاترە لای کەسانی وەک نالی. کۆبوونەوەی خانە دەماری زیاتر لە دوو نیوە گۆی پێشەوەدا زیاتر ئەو کەسانەن، کە بە بواری ئەکادیمی‌و ماتماتیکیەوە خەریکن.

ئەو شاکارانەی بۆ حەبیبەی دارشتوون هەموویان کەفوکوڵی دەروونن‌و واتای خۆشەویستی فێری مرۆڤ دەکەن‌و ئەکەونە خانەی داهێنانەوە. لێرەدا پێویستە خاڵێکی گرنگ لەو نووسینانە دەستنیشان بکرێت، وەک پێشتر ئاماژەمدا لە داهێناندا هەندێک ئارەزوو هەیە پابەندە بە ناچاریەوە. لە سنووری توانای داهێنەرانە بەدەرە. بێ ئاگا دەیخاتە نێو دەریای خۆشەویستی راستەقینەوە؛ وا ئەکات بەرهەمێک وەبەربێت، کە خودو خەڵکیش رازی بکات‌و شوێن لە هزرو ژیانی تاکەکەسدا بگرێت‌و کار لە رەوتی سۆنگە گشتیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بکات. لە لایەک کەفوکوڵی هۆش دامرکێنێتەوە. لە لایەکی‌ترەوە واتای خۆشەویستی راستەقینە بە خەڵکی بدات.

خۆشەویستیی راستەقینە لەم شاکارە داهێنەرانەیدا جگە لە راستگۆیی‌و گەورەیی ئەو وشانە هێندەی‌تر نالی‌یان جوانتر کردووە. ئەڵێت:

**دوور لە تۆ نالی سەگێکە ، بێ وەفایە ، هەرزەگۆ**

**بۆچی بانگی ناکەی ئەم کەلبە ، کە نانی نانییە**(٥٩١:١٤)

یاخود هەتا لە واتای ئەم بەیتە بکۆڵینەوە واتاو مەبەستو لێکدانەوەی داهێنانەی تیادا بەدی ئەکرێت:

**لە دووری**(١٩) **تۆیە ئەی خورشیدی پرتەو بەخشی شەو گەردان ،**

**کە نالی وا لە حاڵەتی میحاقی ماهی نەودایە**(٥٦:١٤)

یاخود چەند دڵخۆشە، کە دڵدارێکی راستەقینە گوێبیستی تاقە وشەیەکی راستگۆیانەی خۆشەویستەکەی ئەبێت:

**تۆ کە حۆریت ، وەرە نێو جەننەتی دیدەم ۰ چ دەکەی**

**لەم دڵەی پر شەرەر و سینەیی سۆزانمدا ؟!** (٩١:١٤)

لە کۆتاییدا ئەتوانین داهێنان لای نالی بکەین بە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** رەگێکی دەماغی هەیە، کە بنەمایەکی جەستەیی مادییە.

**دووەم:** شێوەکەی کۆمەلایەتی- رۆشنبیریە(٥:١٨).

ئەم دوو لایەنە کرۆکی بابەتەکەیە. سەرنجی ئەو نامەو چامانە بدە، کە بۆ کەسانی خوێندەوارو گوڵبژێرەکانی خۆیی ناردوون. بە تایبەتی ئەو چامەیەی بۆ سالمی ناردووە، کە چۆن بە هاواری دەروونو کەفوکوڵی بیرتیژیەوە نووسیووني.

---

١٩- بۆ شرۆڤەی ئەم شاکارە، بروانە چەپکێک لە گوڵزاری نالی، مەسعود موحەمەد، ل ٥٦-٥٧

ئەمانە بوون بە ڕێچکەو چەندین شاعیرو نووسەرو وتارخوێنو ...هتد پەیڕەویان کردووە. تا ئێستاش کاریگەرییەکەی کاڵ نەبۆتەوە؛ لە نامە نووسینو بیری نامۆبوونماندا دیارو بەردەوامە.

داهێنانەکانی نالی وای کردووە پەیوەندییەکان لە ڕەوتی پێگەیشتنی (من) دەرباز بێتو لە خودی کۆمەڵایەتییدا کەڵکە بێتو بەرەو (هەمووان) بەڕێ بکەوێت. پاشان بکرێت بە بەرۆکی وڵاتدا، تاوەکو هەمان هەستی خۆشەویستی دروست بکاتو برەو بەو هەستە جوانە داهێنەرانەیە بدات. کەسێتی کۆمەڵایەتی لە هەموو جموجۆڵێکی ڕۆژانەدا نۆژەن ببێتەوەو نۆژەن بوونەوەی مادیو کۆمەڵایەتی بە دوای خۆیدا کێش بکات[٢٠].

٢٠- دەکرێت خوێنەر بە کتێبەکەی ڕێبوار سیوەیلیدا بچێتەوە، کە ناونیشانەکەی (نالی) یە، کە لە ساڵی ٢٠٠١ دا بە چاپی گەیاندووەو تیایدا بە درێژی باسی لە چامەکەی نالی کردووە.

### ٤. زمان لای نالی

شیعر بەشێکی گرنگی هونەرە جوانەکانە. ئامرازێکی مۆسیقا ئاسای ئاخاوتن‌و دەربڕینی ئەزموونی تێڕوانینی هەستی مرۆڤایەتی‌یە. شیعر ئەو تێڕوانینەیە، کە شاعیر لە ڕێگەی هەڵچوون‌و کەفوکوڵی هەست‌و بیرو هزرییەوە لە ژینگەی مادی‌و مرۆڤایەتی ئەدوێ‌و پێناسەی یاخی بوون‌و گۆڕین‌و بێدەنگ بوون‌و ڕێکخستنیان تیادا بەرجەستە ئەکات. شیعری ڕەسەن خۆی لە ترۆپکی چێژی هەست‌و ویژدانی مرڤدا ئەبینێتەوە. ئەو بوارەش تەنها لە ڕێگەی  وشە ئارایی‌و گەمەی زمانەوانییەوە مسۆگەر ئەبێت.

هەموو نەتەوەیەک لە ڕێگەی زمانەوە لە مەبەستی بوون‌و هەیبەتی مادی‌و کۆمەڵایەتی خۆی ئەدوێت‌و ئەنووسێت. زمان وەک تەزووی کارەبا کار لە هەڵسوکەوت‌و مامەڵەو پەیوەندی‌و بیرکردنەوەو ڕێکخستن‌و کارابوونی هزری مرۆڤ ئەکات. زمان ئەبێتە کەرەسەی ئەو شێوە ئاماژەو دەربڕینانەی، کە ڕەوشە مرۆڤایەتیەکانی بیرو هزرو سۆزو ئیرادە (ڤالیا) پێوانە بکات. بتوانێت شرۆڤەی بابەت بکات‌و وێنای چەندین خەسڵەتی مادی‌و مرۆڤایەتی کۆمەڵگە ئاڵوگۆڕ بکات‌و مانای شایستەیان پێ ببەخشێت. وەزیفەی زمان دەربڕینی ئەو هەقیقەتانەیە، کە پەیوەندیەکانی مرڤ‌و خاک‌و نیشتمان‌و بیرو هزرو ڕۆشنبیری‌و شارستانی‌و کلوتوور (ڕۆشاک) ئەخەنەڕوو. دەرەنجامی تێفکرین‌و کاریگەری بونیادو سیستەمی مادی‌و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە مرۆڤ بە چەندین بابەتی سۆزو خۆشەویستیەوە پابەند ئەکات. مانای بوونی مرۆڤ‌و مرۆڤایەتی لەو پەیوەندی‌و دەرەنجامەوە ئاشکرا ئەکات.

له ڕێگەی ڕێکخستنی تایبەت‌و ماناداری زمانەوە وشەو دەستەواژەی تایبەت‌و گشتی ڕیز ئەکات‌و دایانئەڕێژێت. پێودانگی پەیوەندی‌و تێڕوانینی کۆمەڵایەتی‌و هزری‌و بڕیاردانی بۆ بەرجەستە ئەکات. هەوڵ ئەدات لە واقیعی مامەڵەو پەیوەندیەکان بدوێت‌و ببیانکاتە ئەزموون‌و ماناو داهێنانی نوێی جیاوازیان لەسەر بونیاد بنرێت. واتە لەم ڕوانگەیەوەیە جیاوازی مانا زمانی شیعری دروست ئەکات. ئەو جیاوازیانە وابەستەی هەندێ بنەمان، کە بابەتی زمانەوانی نین، بەڵکو ئاماژەی هەندێ کەرەسەن، کە ئەبەنە ئەو بابەتە جیاوازانەی بە بواری زمانەوانیەوە ئەلکێن. زمانی ئاخاوتن یەکێکە لە گرنگترین کەرەسەکانی زانستی مرۆڤایەتی، بە فاکتەرێکی گرنگی تێگەیشتن‌و تێکەڵاو بوونی مادی‌و کۆمەڵایەتی نێوان خەڵکی دائەنرێت. بەکارنەهێنانی زمان هۆکاری سەرەکی ماڵئاوایی کردن‌و پووکانەوەی هەموو بوارە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەیە. زمانی ئاخاوتن بە شێوەیەکی زۆر تۆکمە بە هۆش‌و گۆش‌و بیرەوە وابەستە بووە. ترپەو جووڵەکانی هزر، ئاماژەو هاوارو بیرکردنەوەن. تەنها لە ڕێگای زمانەوە دەرئەکەوون. ئەگەر نا ئەوە لە ڕێگای هونەری جیاوازی وەک تابلۆو مۆسیقاو سەماو ...هتد هەوڵ ئەدرێت ئەو ترپەو جووڵانە بخرێنە ڕوو. ئەمەشیان وابەستەیە بە پێشکەوتنی زمان خۆیەوە. هونەرە جوانەکان ئەو بیروبۆچوون‌و بیرکردنەوانە ئەکەنە ڕاستی‌و بە مێژووی ڕۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتووری کۆمەڵگەی ئەسپێرن.

لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەم زمانی ئاخاوتن‌و نووسین وەک کەرەستەیەکی زانستی گرنگ لە پلەو ئاستی شارەزاییانەی بەکارهێنانیدا لای نالی ئاماژە پێبدەم، پێش هەر شتێک نالی توانیویەتی داهێنانێکی نوێ بۆ سەردەمێکی مێژووی ئەم نەتەوەیەو

ئێستای مسۆگەر بکات. پێش ئەوەی نالی ئەم هەوڵە بکات بە سەرەنێزەی داهێنانو سەپاندنی بوونی نەتەوەیەک، زۆر کەسو زاناو بلیمەتی ئەم نەتەوەیە لە ترۆپکی زانستی زمانی عەرەبیو فارسیو تورکیدا قاڵ بووبوونەوە. بە رادەیەک توانیویانە پەراوێزی گرنگو زیندوو بۆ رەوتی زمانەوانی بنووسنەوە. وەک مەلای ئیبن ئەل ئادەم، مەلای خەتێ.

ئەگەر زمانێک بەکارنەیەت، ئەوە گرنگیەکەشی لە پریاسکە ئەنرێت، بنەماکانی بوونی نەتەوەیی ئەو بایەخەی نامێنێتو شوێنکەوتەییو پاشکۆ بوون ئەبێتە خەسڵەتو کار لە لێکترازانی بونیادو سیستەمی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکە ئەکات. ئەگەر زمان رەوتی بەکارهێنانی شایستەی خۆی نەگرێت، ئەوە هیچ پێویستیەکی بە رێزمانو واتا دارِشتنو دەستەواژە گۆرِینو پێشکەوتن نامێنێت.

نالی هاتو هەموو ئەو سۆنگە ناوازەو دزێوانەی بەلاوەناو هەموویانی خستەوە سەرپێی خۆیان. جیاوازی وردو پووختی لە زمانی کوردیدا هێنایەکایەوە. لێرەوە مەبەستی نالی ئاشکرا ئەبێت، کە نەیویستووە تەنها شیعر دارِێژێتو مانەندی بابەتەکان بکات، بەڵکو کرۆکی مەبەستەکەی پێگەیاندنو گەیاندنی زمان بووە بە ترۆپکی دەربرِینو بەکارهێنانی لە ئاستێکی بەرزی واتاداردا، کە هەموو شتێکیتری دڵسۆزی نەتەوەیی پێوەلکاوە. چونکە بەکارهێنانی زمان پێش واتا ئەکەوێت، نالی ویستوویەتی ئەم زمانی ئاخاوتنە بکاتە واتای بوون. واتە واتا شیعریەکان لای نالی ئاماژەیەکی گرنگو چالاکیەکی خێرای درککردنو بیرکردنەوەی خۆی بووە. لەو باوەرِەدام، وەک مارکس درکی بەوە کردووە، کە ((اللغة هي حقیقة الفكر المباشرة)) ئەو شاکارە شیعریانەی لەبەردەستی ئێمەدان کەرەسەو بنەمایەکی زانستی مادیو

کۆمەڵایەتی ئەچەسپێنن. ئەو هەوڵانەن، کە مەبەستیانە لە دامێنی چیایەکی سەرکەش و بەرزەوە بەرەو لوتکەمان بەرێ بخەن. مرۆڤ ئەوکاتانەی چمکی هەقیقەتێکی بۆ ئاشکرا ئەبێت مانای ئەوەنییە، کە ئیتر ئاسودەیەو دڵی ئاوی خواردۆتەوە. بەڵکو پێویستی بەوە هەیە، کە لە چۆنییەتی ئەو دڵنیایی و گەیشتن بەو هەقیقەتە تێبگات. لەگەڵ بەرژەوەندی و داخوازییەکانیدا بیانگونجێنێت. مرۆڤ لەو سەرقاڵییەیدا ئەگاتە ئەو باوەڕەی، کە هەقیقەت تەنها تایبەت نییە بە خۆیەوە، یاخود پلان بۆ دارێژراونییە، کە لە ڕێگەی ڕەوشێکی روون و هەست پێکراوی ئامادە کراودا بەرجەستە بووبێت. بەڵکو هەقیقەت تێگەیشتنە لە مرۆڤەکە خۆیی و تێگەیاندنی دەوروبەرەکەیەتی. بۆ بەردەوام بوون و بەشوێندا گەڕان. نالی لە شاکرێکی پڕماناد ا ئەڵیت:

**وا ضەن مەبە ڕووخساری تۆ غائیبە قوربان**

**بنواڕە چلۆن نەقشە لە نێو دیدەیی تەڕما**

**یا توربەتی، یا غوربەتی باری بشکێنین**

**هەر مونتەظیرە (نالی) ئەگەر مرد و ئەگەر ما**(١٤:١٢١)

ئەو شێوە تێگەیشتن و تێگەیاندنە زمانەوانییانە نالی لە زمانی بەرجەستەییەوە کردوونی بە تابلۆیەکی ڕاستەقینەی دیدەی خۆی. کردوونیەتە ڕێوگەیەک (مدخل) بۆ درککردنی ئەو زمانەی شرۆڤەی هەقیقەتی فیکری خۆیی پێ ئەکات و لە سنووری تاکەکەسی رزگار ئەکات. چونکە (***زمان***) وشەیەکی مەزن و پڕ مانایە. باڵای زمان هێندەی باڵای هەموو شت و بابەتێکە. زمان خاوەن توانایەکی گەورەی ئەوتۆیە، کە مرۆڤ ئەگەیەنێت بە کرۆکی مانای ئەو درک و تێگەیشتنە. هەر لەو مانایانەوە

بونیادی نویٚو بۆچوونی بەڵگەییو وێناکردنە مادیو بۆچوونە هزرییەکان بەرجەستە ئەبنو وا ئەکەن نالی وتەنی بە شوێنیدا بگەڕێین.

مرۆڤ تاکە بوونەوەرە خاوەن زمانی ئاخاوتن بێت. ئەم بەشە گرنگە لە تیۆری پەرچە کرداردا لە ناوەندە کۆئەندامی دەمار، کە لە درکە مۆخو دەماغ پێکهاتووە، ئەرکی سەرەکی ڕێکخستنی چالاکیە دەماریەکانە. دەماغ بە تەنها زۆر ئاڵۆزو تێکچڕژاوە لە مێشکو مێشکۆڵەو لاکێشە مۆخ پێکدێت. واتە:

مێشک+ مێشکۆڵە+ لاکێشە مۆخ= دەماغ.

درکە مۆخ+ دەماغ= ناوەندە کۆئەندامی دەمار.

بە گشتی کراوە بە دوو بەشی سەرەکیەوە: سیستەمی ئاماژەییو سیستەمی هەستی زمان (زارەکی)[٢١] ناوەندە کۆئەندامی دەمار ناونراوە سیستەمی ئاماژەیی زارەکی **(المنضومە الاشارية اللغوية)**. تواناییەکی بێ سنووری کاریگەری لە بوونیادنانی پەیوەندیو بوارەکانی وروژاندنو پەسەند کردنو بەلاوەناندا هەیە. کرۆکێکی بە واتایە لە مرۆڤدا. ناوەندە کۆئەندامی دەمار لە ڕێگای هەستی بیرکردنەوەو دەربڕینەوە ئەبنە سەرچاوەی ڕەنگدانەوەی هەڵسوکەوتو مامەڵە کردن. هەموو ترپە دەمارییەکان لەو چالاکییەوە بەرجەستە ئەکەنو بەردەوام لە جموجۆڵدایە، تاوەکو ئەیگەیەنێتە ئەو ساتەی هەوڵی پڕکردنەوەی پێویستی کەلێنەکانی ئەو بیرو چالاکیانە بدات.

---

٢١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (طبيعة الانسان في ضوء فسلجة بافلوف، دکتۆر نوری جەعفەر، مكتبة التحرير، بغداد، ١٩٧٨).

کاریگەری ژینگەی سروشتیو کۆمەڵایەتیە، کە لایەنی چەندایەتیو چۆنایەتی کەسایەتی مرۆڤ دیاری ئەکەن، لە ڕێگای پەرچە کرداری دووهەمەوە، **(بنکەی ئەم پەرچەکردارە دەکەوێتە ژێر مۆخەوە)** چالاکی بیری نوێ بۆ مرۆڤ دروست ئەکاتو گرنگی کردەوە ئەهێنێتە کایەوە، مرۆڤ لە ژینگەدا ئەیانکاتە مایەی ئەزموونو هەڵسەنگاندنو هەڵوێستو ڕەفتار. ئەم لایەنە تەنها بە چالاکیو توانای مرۆڤەوە وابەستە نییە، بەڵکو فاکتەرێکە بۆ پابەند بوون بە تێگەشتنی دیاردەو چالاکی هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتیەکانەوە. لە سنوری ئەو ڕێچکە تێڕوانینەدا واژەیەکی کۆمەڵایەتیان ئەداتێ.

ئەو توانای خۆگونجاندنەی لە مرۆڤدا هەیە تەنها بۆ بەلاوەنانو تێرکردنی پێویستیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو لە هەمان کاتدا بۆ گۆڕانکاریەکانیشیەتی، هەموو ئەو بابەتانەی لە کۆئەندامی دووەمدا بەرجەستە ئەبنو پێئەگەن والە کەسایەتی مرۆڤ ئەکەن گرنگی بە پێویستیە ڕاستەقینەکان بدات، وەک پاڵنەرێکی نامادی لە ئارەزوو بەرهەڵستیو هاوڕاییدا گۆڕانکاریی گرنگ لە ژیانی سایکۆلۆژیو کۆمەڵایەتی مرۆڤدا بەرجەستە بکەن[(٩٨:١٥)]. کاتێک لەم تێڕوانینەوە لە ئەزموونی پێگەیشتنی سیستەمی ناوەندە کۆئەندامی دەمار بە هەردوو بەشەکەیەوە (هەستو زمان، یاخود یەکەمو دووەم)ی لە نالی بڕوانین، زمانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ وابەستەی ئەو درکە هەستیارە کردووە، کە بۆچوونو هەڵسەنگاندنی لە پێگەیاندنەوە گواستووەتەوە بۆ بنکە مۆخییەکانو لە ئاماژەیەکی شایستەدا بۆ خۆیی داڕشتووەو پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیی پێ دیاری کردووە، لە یەکێ لە بەیتە شیعرەکانیدا ئەڵێت:

## کەوکەبی طەلعەتی شاهانەیی تۆم بورهانە :

## کە لە سەر موددەعی ، سوڵطانی موبینە جەدەلم(٢٩٠:١٤)

ئەمە ترپەی ئەو دەنگو ئاوازەیە، کە دەرگای تایبەتمەندیو پێشوازیو ناردنی ئاگاداری هەستو زمان لە بواری جیاوازدا بەرەوڕووی بەرابەرەکەی ئەکاتەوە. چاو دەبینێت. لوت بۆن ئەکات. زمان چێژ ئەکاتو پێست هەستی بەرکەوتن بۆ مۆخ ئەگوێزێتەوە. بافلۆف واتەنی ئەمانە هەموویان شەپۆلی موگناتیسی کارەبا ئاسان لەگەڵ سیستەمی ئاماژەی زماندا هاوبەشی دەکەنو کاردانەوەی سایکۆلۆجیو کۆمەڵایەتییان لێئەکەوێتەوە. ئەم بەشە لە ئاژەڵدا ئەگەر پاڵنەرێک نەبێتە هۆی دروست بوونی پەرچەکردار زۆر بە کەمی لە رەفتاریاندا دەرئەکەوێت، چونکە هەژێنەرە دەماغیەکانی ئەم بەشە رۆڵی گرنگ لە ئاژەڵدا ئەبینن.

ئەو کاردانەوانە کاریگەری بەرچاویان لە سەر درک کردنو بەرجەستە بوونی ئەزموون هەیە. خۆ ئەگەر ئەو زمانی نووسینە نەبوایە ئێمە نەماندەزانی نالی ئەوەندە لە خۆڕازیو بیرمەندێکی هزر بەرفراوان بووە. واتە نالی لە شیعرەکانیەوە دیاردەیەکی زمانەوانی لە کرۆکی خۆیدا پەناداوە، جگە لە شرۆڤەی بەرهەمەکانی هیچ کلیلێک نییە دەرگای کرۆکی ئەو مەزنەمان بۆ والا بکات.

ئەگەر سەنج بدەین منداڵ بەبێ فێڵو تەڵەکە لە رێگای جۆرە پەیوەندیەکی ساناوە پەیوەندیەکانی بە ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتیەوە رێک ئەخات. ئەو نێوەندەش کەسە گەورەکانی ناو ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیەتی. زۆرجار ئەگەر بەلاوەنرابێت یاخود پێویستیەکی هەبوبێتو توانای دەربڕینی نەبووبێت، ئەوە بە هۆی ئاماژەیەکی ئاسانەوە وەک زەردەخەنە یاخود جۆرە کرووزانەوەو گریانێک توانیویەتی ئەو

بەلاوەنانەی سەدو هەشتا پلە پێچەوانە بکاتەوەو ئەوجا ببێتە جێگەی گرنگی پێبدانی باوانو دەوروبەرەکەی.

نالی لە ڕێگای زمانەوە ئەم ڕەوشەی گۆڕیوە بۆ دابینکردنی گۆڕانکاری کەسێکیتر، تاوەکو بتوانێت برەو بە پەیوەندیەکانی بدات؛ واتە پێویستی کۆمەڵایەتی لای نالی ئەبێتە چەقی سایکۆلۆژیو هەڵوێستی مادیو کۆمەڵایەتی پێ دیاری ئەکات، بەرفراوانی زیرەکی لە رادەبەدەری خۆیی لە کرۆکی شیعرەکانیەوە ئاشکراکردووە. هونەری گوتنو نووسین لە چالاکی زمانەوانیدا لە بەکارهێنانی زمانی ئاخاوتندا لە لێو بزواندنەوە واتە لە دەنگەوە دەست پێ دەکاتو بە وشەدا تێئەپەڕێو بە ڕێکخستنو داڕشتنی واتا کۆتاییان دێت. ئەم لایەنە بە وردی لەم بەیتە شیعرەی نالیدا بەرچاو ئەکەوێت، کە ئەڵێت:

**((نالی)) حەریفی کەس نیە ، ئیلف ئەلیفی کەس نییە**

**بەیتی ڕەدیفی کەس نییە ، هەرزە نویسە ، گەپ دەکا**(١٤:١٠٠)

سروشتی ئەم کردارە هۆکاری گۆڕانکاری گەورەو گرنگە بۆ گەشەی نێوان باری دەروونیو دەربڕینی زمانو پابەند نەبوون بە دیسپلینێکەوە، کە مرۆڤ لە چوار چێوەی بەکارهێنانی زماندا ببەستێتەوە. ئەو هەستو درکە هزرییەی لە شیعرەکەدا ئاماژەی دەروونی خۆیی پێداون هەژێنەری نوێ لە مۆخدا جوڵاندووە. ئەگەر کۆرپە لە تەندروستی باشدا بژی، بەڵام هەژێنەری نوێی نەبێت ئەوا بە گریان لێی ئەدوێتو ژیر نابێتەوە، تاوەکو هەژێنەری نوێی بۆ دابین نەکرێت. واتە ((کردارە هزریەکان ئەبنە پێشەنگی مرۆڤ. ئەمەش خۆی لە خۆیدا گەشەیەکی فەسلەژیانەیە. لە هەمان کاتیشدا **وەزیفەی** دەماغە بە شێوەیەکی گونجاو داوای هەژاندنی نوێ

ئەکات. هیچ ئەندامێک یان بەشێکی دەماغ گەشە ناکات تەنها لە ڕێگەی وەزیفەوە نەبێت)).[(١٩٥:٦)] ئەوەتا بۆ دەرخستنو کرداری نوێ نالی بەدەر لە هەرزە گۆیی پێویستی بە هەژێنەری نوێتر هەیەو فرمێسکەکانی خۆیی ئەکات بە مرواری، کە تواناو گەورەیی خۆی لەو بەلاوەنانەدا پارێزراو رابگرێت. بە خۆشەویستەکەی ئەڵێت:

**لە ئالیی ئەشکی نالی بێکەسە ، غەڵطانی نێو خاکە**

**مەگەر سەمعی قەبوڵت موشتەریی لۆلۆی لالابێت.**[(٦٠٢:١٤)]

گەشەی کەسایەتی لە ڕێگای دەزگایەکەوە لە گەشەی شێوەو تێگەیشتنی بەکارهێنانی زمانەوە پێودانگ ئەکرێت، کە پێی ئەوتری کۆئەندامە دەماری ئاماژەی دووەم تایبەتە بە گەشەی بەکارهێنانی زمان. ئەم کۆئەندامە تایبەتە بە مرۆڤ خۆیەوە جیاوازە لە کۆئەندامە دەماری ئاماژەی یەکەم. لە سیستەمی زماندا ئابستریکو هەڵسەنگاندن رۆڵی گرنگ لە (هەست)دا ئەبینن.[(٦٨:١٧)] ئەگەر لە دیدێکی فەلسەفیەوە لێی بڕوانین، ئەوە یەکەم کرداری دەروونی بریتییە لە وەزیفەی دەماغ، کە یەکێکە لە کامڵترین شێوەکانی مادە. پەیوەندیە مادیەکانی دەماغە، کە دەوروبەرو هۆشیان پێکەوە لکاندووە. ئەگەر دەماغ درکیان پێ بکات یان نەء، ئەوە بێ ئەوەی مرۆڤ خۆی بیەوێت لەگەڵ ژیانیدا وابەستە ئەبێت. وەک تێپەڕ بوونی ساڵو بەسەربردنی تەمەنو تێڕوانین لە پاشخانی بەسەرچوو.

نالی زۆر نموونەی ئەم لایەنەی هەیە لە شیعرێکی ٢٠ بەیتیدا ئەتوانین ئەم شێوە ئاماژەیەی تیادا دەستنیشان بکەین، کە ئەڵێت:

**زەمانە[٢٢] چەرخ و ، چەرخی ئاسمانیشی ، فەلەک فیلکە**

**سەری ڕشتەی وجودی چەندە باداوی‌یو هەر ماوی[(٦٨١:١٤)]**

لێرەدا هاوکێشەیەکی گەمە ئاسای زەمانمان بۆ دێتەپێش، وتن تەنها نابێتە شیعر، تاوەکو لە ڕێگای دەقە شیعریەکەوە خۆی جیا نەکاتەوە. مرۆڤ لە ڕێگەی درککردنەوە ئەتوانێت خۆی لە چالاکیە هزرییەکانی گۆڕانکاری ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتی دڵنیابکاتەوە.[(٢٠٤:٦)] چونکە بیرۆکەی **زەمەن** لە گۆڕانکاریەکانی واقیعی سروشتەوە بەرجەستە بووە. وابەستەو پێکەوە گرێدراوی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیە. بەبێ بوونی هەندێ سەرچاوەی گۆڕانکاری مادیو کۆمەڵایەتی درک بە **زەمەن** ناکرێت. ئەو سەرچاوانەش زمان جیای کردوونەتەوەو توانای دەربڕینیانی هەیە. بەو واتایەی بە هەندی ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتی زەمانیش بەرفراوانو ئاڵۆزە. لەم بەیتەدا خۆی بەچاکی دڵنیایەو تەمەن بەڕەی بەردەوام بوونی بەرەو تەنکی ئەباتو درکی زەمەنەکەی کردووە، کە ئەڵێت:

**هەر چەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بوو**

**چونکە ئەمەلت زۆرە ، چ عومرێکی کەمت بوو ! [(٣٦٧:١٤)]**

ئەم بۆچوونە والە هەستو بیرو هۆشو کردارەکانی تری هزر ئەڕوانێت، کە بە دوو ڕێگە متمانەیان لەسەر ڕاستیەکانی ژینگەی مادی کردبێت:

**یەکەمیان** لە ئەنجامی ئەو جموجۆڵە فیسیۆلۆژیو جەستەییە جۆراو جۆرانەی لە نێوەندە کۆئەندامی دەمارەوە ڕوودەدەن.

---

٢٢-(بۆ تەواوی شیعرەکە بڕوانە دیوانی نالی، ل ٦٨١ – ٦٩٠)

**دوەمیان** ژینگەی دەرەکیە، کە بوونەتە کرۆکی ئەو جموجۆڵانە. بەم دوو فاکتەرە ئەکرێت ئاماژە بەو کردارانە بدەین، کە بەها راستەقینەکان هەوڵی بونیادنانێکی رێکخراوەیی بابەتیانەی ژینگە مادیو کۆمەڵایەتیو مێژووییەکانی کۆمەڵگە ئەدەن. جگە لە ئایدیاو لۆجیکی باوی سەردەم زمان هەلێکی وا بۆ مرۆڤ ئەڕەخسێنیت، کە چالاکیەکانی تێگەشتنو ناسینەوەو هەست بە خۆکردنو ئاماژەو بینین بتوانن لە توانای بەرفراوانی خۆیان بدوێن. ببنە راوێژو بۆچوونی ژیانی کۆمەڵایەتیو خەڵکی مامەڵەو هەڵسوکەوتی بونیادی لەگەڵدا بکات. واتە خەسڵەتی بابەتیانە بە خۆیانەوە ئەگرن، کە لە سنووری بەرتەسکی تاکەکەس دەربازیان ئەبێتو رەوتی سەردەمەکەی پێ دیاری ئەکرێت. تاوەکو مرۆڤ لەو رێگایەی بەرەو ترۆپکی دەبات دووا نەکەوێت، یاخود تووشی چەقبەستنو شەختە بوون نەبێت، بەڵکو ببێتە سەرەنێزەی گوژمی گۆڕانکاری.

نالی لە یەکێک لە بەیتەکانیدا بە ئاشکرا راوێژێکی بەجێ بۆ هەموو سەردەمێک ئەخاتەڕوو. ئەڵێت:

**ئەسپی نەفەست دێت و دەچێ ، گەرمە عەنانی**

**ئەی مەستی ریاضەت هەلە ! هوشیای جڵەو بە**(٣٩٣:١٤)

پێکهاتەی ئەم کردارانە ئاوێتەی یەکێک لەو کارە هزرییانەیە، کە بەردەوام بۆ رازی بوونو باوەڕ هێنان لە هەوڵی ناسینەوەیداین. لە هەمان کاتیشدا نیگەرانیەکان ئەڕەوەێننەوە.(٢١:١٢٣-١٣٦) لێرەدا ئاشکرایە، کە نالی لە بەرفراوانی تێڕوانینی دەماغی خۆیەوە چۆن ئەیەوێت پەیامەکەی بگەیەنێت، کە لە بنەڕەتدا پێچەوانە کردنەوەو هەڵسەنگاندنی چەق بەستنو هەل لەکیس نەدانە. بنەمایەکە بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی

زەمەن ئەیخاتە پێش مرۆڤ. لێرەوە هەست ئەکەین جۆرێک لە هاوسنگی جموجۆڵی جەستەیی‌و درککردنی دەماغی لەو گەورەییەوە خستۆتە ڕوو.

نالی لە زمانی ئاخاوتنەوە زۆر گرنگی بە واتا داوە بە تایبەتی ئەو واتایەی پەیوەندی بە دووتوێی زمان‌و واتاوە هەبوبێت، واتاکانی خستۆتە خانەی کاری زمانی ئاماژەییەوە. بەو زمانی ئاخاوتنە واتادارانە هەلێکی وا ئەڕەخسێنێت، کە بە تەرزێکی‌تر بمانگەیەنێتە پێودانگی دەرخستنی ڕاستیەک، کە ئاستی تێگەشتن‌و هەست بە خۆ کردنی لێوە پێودانگ بکەین. ئەو توانایانەشمان نیشان ئەدات، کە خودی کەسایەتی خۆیی لە کام پلەدا ناسیوەتەوەو لە کام ئاستەدا هەڵیسەنگاندووە. لەو پێکهاتە ئاماژەییانەوە واتاو نموونەی بابەتێک ئەخاتە ڕوو، کە ئێمە بیگوێزینەوە بۆ ناو ڕەوتی باوەڕو پێی ڕازی بین. تێبینی ئەوە ئەکەین تێڕوانینی بیری نالی جموجۆڵی جۆراوجۆری تیادا بووە. ئەو جموجۆڵەی بە ئاماژەی زمانەوانی دەربڕیووە.

ئەو کارانەی نالی بۆ ئەو سەردەمە لە بواری زمانی کوردیدا نوێ بوون. لەبەرئەوەیە خەسڵەت‌و تەرزی هەژێنەرەکان چڕو جیاوازن. لە ڕێگای تێمپۆراڵی ناوەندە کۆئەندامی دەمارەوە پێشوازی ئەکرێت. مرۆڤ بەپێی تێگەیشتنی خۆی پێکهاتەیەکی وشیارانەی لێدەرئەهێنجێت، کە ئەم کارە ڕاستەوخۆ لکاوە بە سیستەمی زمانەوە.(٣١) تەنها لە ڕێگای بیستن، یاخود خوێندنەوەوە زمانی واتادار نابێتە یادەوەری. ئەو کاتانەی پارچە میوزیکێک، یاخود گۆرانیەکی خۆش لە دەماغدا جێگیرئەبن لەگەڵ گوێبیستنی یاخود وروژاندنی بابەتێکی بینین یاخود بیستندا یادەوەری نوێ لەگەڵ بابەتە چەسپاوەکەی پێشتری دەماغدا بەراورد ئەکرێت.

تەنانەت رژێنەکانی درک کردن وا ئەکات خوێندنەوەی تایبەتی بۆ بکرێت، وەک جۆرێک پێگەیاندنی تیۆری بەرەو پراکتیزە بوون هەنگاوبنێت.

خوێندنەوەو نووسینی زمانی واتادار لە رێگای تێفکرینو چاوی بینینو خوێندنەوەوە بەرەو دابەشکردنو هەڵسەنگاندنەکانی پێ ئەگرێت. ئەم کارە پێویستی بە جۆرێک پاشخانی وشیاریو زانست هەیە. ئەو گەمە زمانەوانیەی نالی کردوونی مانای وایە، کە زمانو واتا دەرگای راستی نهێنیەکان والآ ئەکات. نالی لەم شاکارە شیعرەدا نموونەیەکی بەرزی زمانو واتای تیادا ئاماژەداوەو ئەڵێت:

**ساقی ! وەرە ، مەیخانەیی دڵ کۆنە ڕەحیقی**

**گەر مایلی طەوفی حەرەم و بەیتی عەتیقی !**

**یەک ڕەنگم و بێ ڕەنگم و ڕەنگین بە هەموو ڕەنگ**

**بەم ڕەنگە دەبێ ڕەنگ ڕێژیی عەشقی حەقیقی**

**مرواریی ئەشکم وەکو یاقوتی ، ڕەوانە**

**ساقی ! بدە لەو لەعلە شەرابێکی عەقیقی ..**

**دائیم لە حەضەردا سەفەری بە .. لە وەطەندا**

**غوربەت کەش و عاجز بە ، گەر ئەهلی طەریقی**

**خەڵقی کە هەموو کۆدەکن و بەستە زوبانن ،**

**با بێن و لە ((نالی)) ببیەن شیعری سەلیقی.** (١٤: ٦٥٥ ـ٦٥٧)

هونەری زمانی واتاو ئاماژە لەم شیعرەدا زیاتر لە پیرۆزیی ئەقڵەوە تێی ئەڕوانرێت وەک لەوەی دارشتن بێت. ئەو شوێنەی نالی هەڵبژاردووە بە پێی یاسا ئاییینیەکان شوێنی سەردانی هەموو مرۆڤێکی خاوەن باوەڕی پاکو بێگەردە، شوێنی ئەوانەشە،

کە ویستی تۆبەو خۆ پاککردنەوەیان هەبێت، بۆ ئەو شوێنە لە سێ لایەنەوە مامەڵەیەکی زمانەوانی واتاداری زیندووی لەگەڵ رستەکاندا کردووە. وەک جەستەیەکی پیرۆزی زیوین بەردە رەشەکەی ئاسمانی گواستۆتەوە نێو دەروونی خۆی. ئەمەش پابەندە بە هزرو تێگەشتنەوە، کە بەرهەمی تێڕامانی رەسەنایەتی بیرکردنەوەی خۆیەتی، یاخود دیدو بۆچوونی حەقیقەتی ئەروای (رۆحی) بێگەردی دنیای خۆیەتی، وەک نەمرییەکی بۆ پاش خۆیی بەجێهێشتووە. ئەوە ناخی ئەو زاتە مەزنە خۆیەتی، بۆیە وا بە راشکاوانە هاواری ئارەزوومەندانی ئەو شوێنە ئەکات، کە بێنو ئەوان پێش چوونیان بۆ ئەو مەزارە، ببنە میوانی دنیای هزرو بەخۆدا چوونەوەو کوێرانە رێ نەگرن.

نالی گۆشەکانی کابەی لە چوار لایەنی رەفیق، حەقیقەت، تەریقەت، سەلیقەتی بە رەسەنایەتی داناوەو بیری خۆیی بە بابەتەکەوە بەستۆتەوە، وەک چوار مێخەکەی دنیا مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکات. ئەمەش ئەو دوو حەقیقەتە دژەن، کە کرۆکی پیکەوە ژیانو رێگای بیرکردنەوە لە خولی کێبەرکێدا ئەخولێننەوە. لێرەوە نالی زمانی واتاداری کردۆتە فاکتەرێک بۆ دەربڕینو ئاشکرا کردنی ئەو بازنەیەی، کە ویستویەتی وەک دیکارت بابەتەکان پشانی خەڵکی بدات. شێوازی دەسەلاتی ئەو سەردەمە بە بەستنەوەی دیدی ئایینیەوە بۆ خەڵکی ئاشکرا بکات(٢٣).

لە رێگای جوانیو پاراوی زمانەوە رەسانەیەتی بۆچوونەکانی هەردوولا لە چێژی بەردەوام لە گەشەی ئەو تێکەلاوبوونو ئاماژانە وەرگرێت، کە بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی ئێستاو بەلاوەنانی رابردوو ئەدوێت. هەر ئەمەشە ئاماژە نەمری بە

---

٢٣- دیکارت دەڵێت: "شیئا مایشک ویدرک ویؤکد ویستنکر ویرید ولایرید ویتخیل أیضا ویشعر.

ڕەوتی بیرکردنەوە بۆ چێژو هەوڵدانو داهێنانو ئاسودەییو بەردەوامی ژیان لە هەڵسوکەوتو مامەڵەدا بداتو بڵێت:

**تۆ باقییەیی ساقییەیی صەحنی چەمەن بە**

**مەیدان هەموو مەی دانە بە کاسات و بە طاسات**(١٤٤:١٤)

ئەمە وا ئەگەیەنێت خۆ دوورە پەرێزگرتن لە لێپرسراوێتیو خۆدانە دەست ڕێکەوتو سەرنووست لای ئەم مەزنە دوای کڵاوی بابردوو کەوتنە. کەوتۆتە ئاستی هیدیۆنیزمەوە، کە بە واتای گەڕان بەدوای چێژو دورکەوتنەوە لە ئازارو حەژمەتەکانی ژیان دێت. هەر ئەمەش پەلکێشی ئەو چێژو بیرکردنەوە خۆشانەی کردووەو هەوڵیداوە لە ڕێگای دارشتنی پوختی زمانەوانیەوە زۆرترین چێژ بە کەمترین هەوڵ لە خۆشەویستی مرۆڤایەتی لێوان لێو بکات. ئاماژەو واتا بدات بەو داهێنانەی خۆی ئەو چێژەی لێوەرئەگرێت. لەم لایەنەوە ئەڵێت:

**بیستم لە هەموو لایە مەیلی شەڕ و دەعوایە**

**سەودا لە سەرمدایە ، باکم چ لە غەوغایە**(٥٦١:١٤)

ئەم شێوازی بەکارهێنانە شێوازێکی نەریتی ئەو سەردەمە بووە، کە بە ڕەسەنایەتی ئەدرێتە قەڵەم. هەموو ئەو هەوڵانە لە خۆیان ئەگرن، کە نالی بۆ خستنە گەڕی هۆشو گۆشو بیری لێپرسراویەتی بەکاری هێناوونو لە هەڵوێست وەرگرتندا ڕەنگی پێداتەوەو بڕیار ئەدات، کە سوورە لە سەر رای خۆی، بۆیە زۆر بێ منەتە لە تواناو هەڵوێستو بەرفراوانی بیری هزرمەندانەی خۆیو جارێکیتر لەو غەوغایەوە خۆی لە ترۆپکی بەرپرسیارێتیدا ئەبینێتەوەو بێ منەتانە ئەڵێت:

((نالی)) کە  ویقاری  نییە ، بێ باکە لە خەلقی

سۆفی کە سلوکێکی هەیە ، عوجب و ریایە(١٤: ٥٦٣ ـ٥٦٥)

هەڵسەنگاندنی خود شێوازێکی جیاوازە مرۆڤ هەرگیز نایەوێت بەری لێ بگیرێت. بەردوام لە هەوڵی بە دەستهێنانی زانینو ئاشکرا کردنی بابەتی نوێیە لە خۆیدا، پاشان هەوڵی گواستنەوەی بۆ دەوروبەر ئەدات. بە وەرگرتنی بڕیارێک ئەیکاتە بنەما بۆ پێدانی واتاو بەرز نرخاندن، کە دەسەڵاتی زمان ئەم هەڵسەنگاندنە دیاری ئەکات.(١٥:١٦٥) نالی لە بەیتێکی نایابی پڕواتای زمانەوانیدا بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە بە خۆشەویستەکەی ئەڵێت:

شایستەیی شان ، لایقی مل طوڕڕەیی تۆیە

نەک طوڕڕەیی شاهەنشەهی‌یو طەوقی وەزارەت(١٤,١٤٥)

ڕووداوی ڕاستەقینە ئەو پێودانگە جێگیرەی زمانە، کە هەندێک جار خود ناتوانێت بەو شێوە گونجاوەی خۆی مەبەستێتی لێی بدوێتو کۆنترۆڵی بکات. لەوانە گرفتی مردن، دەست گرتن بە سەر ژینگەدا، بەرهەڵستی جەستەیی‌و ئەو پێداویستیانەی کۆمەڵێک یاسا بەسەریا دەسەپێنێت، مرۆڤ ناچار دەبێت پەنا بۆ خستنە بری‌و بەرز نرخاندنی بەرامبەرەکەی یاخود هەڵاتن بەرێت. نالی ئەو ڕەوشە دەروونیەی ناخی خۆیی بە دەربڕینێکی داهێنەرانە بە زمانی شیعر ئاماژە پێداوەو ئەڵێت:

لە ئاب و تاب و ئەشک و ئاهی خۆمدا بووم بە بوریانی

لە باتیی پوختەگی سوتاوم و ئێستەکەش پێم دەڵێ: خامە

نیشانەی پوختەگی بێ دەنگییە ((نالی)) ! ئەگەر پوختەی

بەحوججەت طەی بکە نامە ، بە حیددەت پەی بکە خامە(١٤:٤٧٣)

زۆر شاکارەکانی نالی لە رووی زمانەوانیەوە بارێکی گرێ لێدراویان دروست کردووە. ناچار پێویستە پەنا بۆ چەندین شێوە ئاسان کاری زمانەوانی بەرین، وەک بەراوردکاری وشەی پۆزەتیڤو نەگەتیڤ، تەناسوبو وێکچوونی لایەن (تەشابهی ئەتراف)، تەوریە، حوسنی تەعلیل، کینایە، ئیستعارەی موسەرەحە (شوبهاندنی دووشت بە یەکو ناوهێنانی شوبهێنراوەکە)، ئیستعارەی مەککینە (شوبهاندنی دوو شت بە یەکترو ناوهێنانی شتەکە)، لەفو نەشر، موبالەغە، لەطافەت، شوبهاندنی پێچەوانە ئەوجا بۆ قاڵ بوونەوەوی تایبەتمەندانەو چەندین بەشو لکوپۆپی تریان لێئەبێتەوە[٢٤].

لە کتێبی (المقدمة) دا ئیبن خەلدون زانستەکانی زمانی عەرەبی دابەشکردووە بۆ: (زمان، نحو، بیان الادب) زانینی ئەم بنەمایانەی بە گرنگ بۆ خەڵکی خوێندەواری ئاینی ناوزەد کردووە. لە زووەوە خەڵکانی بلیمەتو بە توانا لە سێ لایەنەوە گرنگیان بە زمان داوە لە رووی ئاخاوتنو واتاو دیاری کردنی ماوەی نێوان دەستەواژەکان. بۆ پاراستنی ئابڕوی واتای شیعرو راستیو جەربەزەیی وتن لە نووسینەوەی دەقە شیعریەکەداو لە کێشەی دەربڕینی واتاکاندا.[١٧:٢١] وتنو واتا بنەی سەرەکی شیعرن بۆئەوەی رەواڵەتو ناوەڕۆکی شیعرەکە پێکەوە ببەسترێتەوە. لە پارچە شیعرێکی ١٨ بەیتی نایابی نالیدا جگە لە شرۆڤە کردنی جیاوازی واتاکان کە خوێنەر خۆی ئەتوانێت لە دیوانی نالیدا واتای نوێتریشیان لێوە دەربخات. ئەوە ئەو بوارانەش بەرچاو ئەکەون، کە زمانەوان بە بنەمای

---

٢٤- (بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە بروانە دیوانی نالی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ ل١٦– ٢٢)

شارەزایی دارشتنی نووسین‌و ئاخاوتنی دائەنێن‌و پڕە لە هەموو ئەو یاساو ڕێسایانەی تواناو سەلیقەی زمانەوانی دەرئەخەن. لە شیعرەکەدا نالی ئەڵێت:

**شەوی بەهاری جوانی بوو پڕ تەشویر**

**لە فەجری پایزی پیری بەیانی دا تەعبیر**

**چ شەو ، چ ڕۆژ ؟ وەها کورتی لەهو و لەعب و میزاح**

**کە هەردوو وەک یەکە چون بە نەغمەیی بەم و زیر**

**ئەسەف درێژی شەو و رۆژی ئەو شە و ڕۆژەم**

**قوصوریان بووە طولی نەدامەتی تەقصیر**

**سەوادی طوڕڕەیی ئەو ئیشتیباهی سەهوی جوان**

**بەیاضی غوڕڕەیی ئەم ئینتیبهی سوجدەیی پیر**

**وەکو نەهاری بەهاری درێژ و پایزی کورت**

**ئەمەل گەلێک و طەویل و ، عەمەل کەمێک و قەصیر**

**غوباری ئەو شەو و ڕۆژەن ڕدێنی ماش و برنج**

**کە تێکەڵن شەبەهی صوبح و شام و شیر و قیر**

**سپی نەذیرە هەموو موو لە سیرڕی (وجە) لە سەر**

**مونەووەرە ، لە طەرەف نورەوە بووە بە نەذیر**

**مرووری نەکسە کە عەکسی قەمەر دەکا بە ڕەمەق**

**ذبوولی نیکسە دەگێڕێ کە عەکسی ڕیش بە شیر**

**دەلیلی ڕۆشنە بۆ بەدء و عەود و کورتیی عومر**

**تەنی هیلال کە بە طلعەت جوان ، بەخەڵعەت پیر**

له شەرحی هەیئەتی مەتنی بەدەن کە هەر جوزئی

سەقیمە ، عاجزە تەصحیح و رابیطی تەدبیر

تێدا حەدیثی حەداثەت ضەعیفە و مەترووکە

کە قەطعە صیححەتی ئیستنادی عەنتی تەقریر

چ مشت و پەنجە ؟ وەکو مشتی شانە ڕەق کە دەڵێی

لەشانیدا نەبووە دەستو بردی کوشتوگیر

چ قەد کوانێ ؟ وەکو پێ شکاو و ئوفتادە

کە بازی سێ قەدەمی قەت نەداوە وک پەڕی تیر

لە نەحو صەرفی ئەداتی مەپرسە ئەی موعریب

کە ڕەفع و نەصب و جەڕ و جەزمە ئالەتی تەقریر

وەها سەقیم و موجەززا عەوامیلی ئەجزا

کە ئالەتی عەمەلی نەحوی مەحوی صەحوی ضەمیر

حورووفی جەڕڕە تێیاندا نەماوە ئاوی عەمەل

هەمووی موعەلەق و مولغایی عامیلی تەقدیر

بە غەیری (عەن) کە لە بۆ نەزع و عەزلی زەنبوورە

کە ژاری ماری نەچێژێ عوسەیلەیی هەنجیر

خروجی (با) لە لوصوق و (عەلا) لە ئیستیعلا

دخوولی عەتنەیی (عەن) فاصیلە لە تیری جەفیر

ئەلیف نەکیرەوو بێگانە ، نایەتە تەعریف

عەلەم موشابیهی غەیر و مولازیمی تەنکیر(١٤:٢٠٤ـ٢١٦)

راستە زمان دەرگای چوونە ژوورەوەی راستیيە کۆمەڵایەتیەکانە. هەرچەند بیرمەندانی سۆسیۆلۆژیا زمان ناخەنە خانەی تێگەیشتنی هەڵسوکەوتەوە، بەڵکو لە روانگەی کێشەی کۆمەڵایەتیو کرداری تێکەڵاوبوونەوە رۆڵی گرنگی گونجاندنی بیروبۆچوونی ئەدەنیو مرۆڤ شۆڕەندی کاریگەریەکانی زمان ئەکەن. نالی لە رێگای ئامڕازەکانی لێدوانەوە توانیویەتی هەموو پێشهاتەکان لە رێگای هەڵچوونی واتادارو بەرفراوانی هزری خۆیەوە بۆ گوزارشی ژیانی بابەتی بوون بگوازێتەوە. توانیوویەتی چالاکی کۆمەڵایەتیانەی کۆمەڵگەی پێ دیاری بکات. مرۆڤ ناتوانێت بەبێ بەکارهێنانی زمان لەگەڵ کرۆکی دەوروبەرە کۆمەڵایەتیەکەیدا بسازێت. لەبەرئەوەی زمان فاکتەرێکی زیندووی بیرکردنەوەو زاڵ بوونە بەسەر ئاستەنگە کۆمەڵایەتیەکاندا[(٢٢:٨٠)]. ئەو دەستەواژەو زاراوانەی روو هەڵماڵراون[(٢٥)] یاخود تا رادەیەک بابەتی کۆمەڵایەتی گشتی نین، کە کاتێک بەکارئەهێنرێت هیچ رێگریەک بۆ بەکارنەهێنانی نییە، بەڵام بۆ ئەوەی تێمپۆڕاڵێک دروست بکات ئەوە پەیڕەوی یاساو رێساکانی زمانەوانی ئەگیرێتە بەر وەک ئەو شیعرە نایابەی نالی، کە بەزمانی کەرەکەی ئەدوێت، لە کۆتایی شیعرەکەدا ئەڵێت:

**چەندە پێم خۆش بوو زوبانی حاڵی دەیوت ((نالیا))**

**هەردو حەیوانین ، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ.** [(٢٢٨:١٤)]

ئەم شیعرە نایابە جگە لە لێکدانەوە جیاوازەکانی بۆی کراوە ئاستێکی بەرفراوانی بیرو بەدواچوونی نالی پێوە دیارە، کە ئەیەوێت وەک ئەرستۆ بڵێت: ((**مرۆڤ ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتیە**)) واتە پێویستی بە رێزو پاراستنی مافەکانی هەیە.

---

٢٥- وەک شاکارەکانی شێخ رەزای تاڵەبانی

هەموو زمانەکان لە دنیادا سیماو خەسڵەتی تایبەتی خۆییان هەیە. تاوەکو ئێستا هیج جۆرە لێکچوونێکی تەواوەتی لە نێوان دوو زماندا نەبینراوەتەوە، کە هەمان سیماو خەسڵەتیان تیادا بێت. هەر ئەمەشە وایکردووە ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە لە گۆشە نیگای زمانەوە بەردەوام ئارەزووی هەڵوێستو پێشخستنی تێدا بدرێت.

زمان لای نالی بەو خەسڵەتانەی لە شاکارەکانیدا بەکاریهێناون لە جیاوازیو دابڕاندنیان بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەستونیەتیەوە بە (واقیعە) کۆمەڵایەتیەکەوەو توانیویەتی لەو پێگەیەوە بارێکی بیریو دەروونیو سۆزو خۆشەویستیو راڤەو خەیاڵ بکاتە بەردەبازی ناسینو پێگەیشتن. دارشتنی شێوە زمانێکی رەسەنی نەتەوەیی بچەسپێنێت. تاوەکو بتوانێت بە فەرمی پێی بنووسرێتو پێی بخوێنرێتەوەو ئاخاوتنی پێوە بکرێت. نالی لە رێگای هەڵبژاردنی ئەم شێوە زمانەوە چەندین رۆڵی بەرچاوی بە هەڵوێستی کۆمەڵایەتی، ئایینی، جموجۆڵی رەوشتو هەڵسوکەوت، وانەی پۆزەتیڤو نەێگەتیڤ داوە، بۆئەوەی ئەمڕۆو داهاتوو کارو ئاخاوتنو باسو بەدواچوونەکان جۆرێک ئاسانیان پێوە دیار بێت. لەم توانا بەرفراوانە زمانەوانیەوە دەرئەکەوێت، کە نالی دوو سەرچاوەی سەرەکی کردووە بە رەوتی بەکارهێنانی ئەو زمانە کوردییەی، کە:

**یەکەمیان**. بە ئاگا بووە لە رۆشنبیری، شارستانی، کولتوورو زانستی بەربڵاوی ئەو سەردەمەو سەردەمە مێژووییەکانی پێش خۆی. ئەمە بە فاکتەرێکی گرنگ دائەنرێت بۆ پتەو بوونو گەشە پێدانی ئەو هەوڵە زمانەوانیانەی نالی بەرجەستەی کردوون. تاوەکو ئێستاش کاریگەری ئەو لایەنە بە مێژوی سەردەمانەی ئێمەوە دیارە. هەموو

ئەو زاراوەو دەستەواژە زمانەوانیەی کە لە کۆمەڵگەدا هەبوون شارەزایانە کۆیکردونەتەوە. توانیویەتی شێوازی داهێنانەکەی پێبهێنێتە کایەی زیندوویەتیەوە. یەکێک لەو هۆکارانەی کار لە زمان ئەکات کاریگەری ژێر دەستەیی‌و سەر دەستەییە. لەو بارەوە نەک تەنها کورد بەڵکو هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکە وای لە تورک‌و فارسیش کردووە، کە ئەگەر زمانەکەی نەگۆڕی‌بن بە عەرەبی، ئەوا زۆر وشەی عەرەبی تیادا چاندوون. بیرمەندە ئەنترۆپۆلۆژیەکان وای بۆئەچن، کە پێویستە ئاستی پێودانگی (رۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتوور) ی کۆمەڵگە بە تێکەڵاوی وشەی هاوردە لە کۆمەڵگەکانی ترەوە پێودانگ بکرێت. واتە چەند وشەو دەستەواژەو زاراوە لە کۆمەڵگەی یەکەم یاخود بە پێچەوانەوە وەرگیراوە(٣١٢:١). خۆ ئەگەر زمان بەو رادەیە بەرفراوان بێت‌و کاری سەپاندن‌و کاریگەری بەسەرەوە نەبێت، ئەوە کۆمەڵگە ئەتوانێت سەرچاوەی رۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتووری دەرەکی خۆی زیاتر برەو پێ بدات. ئەمە لای نالی هەوڵی بۆ دراوەو بە راستی روویداوە. لەو کاتەی لە مەدینە بووەو قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە. زمانی لە سنووری وڵات هێناوەتە دەر. بە کوردیەکی رەوان‌و ئاشکرا ئەڵێت:

**ئەگەرچی کوردی دووری شارەزوری قەسوەتم ، ئەمما**

**وەسیلەم طەیبەو و حیلمی شەفیع و فەضلی مننانە**(٥١٧:١٤)

**فاکتەری دووەمیان:** هۆکاری گۆرانکاری لە زماندا تەنها لە ژێر کاریگەری دەرەکیدا روو نادات. وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا بە هەمان پلەو شێوە متمانە دەکاتە سەر فاکتەرە خۆییەکان. فاکتەر هەیە لە زماندا خۆی خۆی ئەگۆڕێت. ئەم لایەنە، وەک بیرمەندانی زمانەوانی دایانناوە لۆژیست‌و پێکهاتە دەنگیەکانە کە لە هەندێک زماندا

روو ئەدەن. بۆ نمونە وەک (ذ، ع، ق، ط، ث و..). لە لێکۆڵینەوە ئەترۆپۆلۆژیەکاندا دەرکەوتووە پێکهاتەکانی تۆڕی رۆشنبیری، شارستانی، کولتووری کۆمەڵگە ئەتوانێت لە پێودانگی زمانەوە لە خۆی بدوێ. چونکە ناکرێت تەنها لە رێگای تێبینیەوە لە رایەڵە سەرەکیەکانی هیچ رۆشنبیریو شارستانیو کولتوورێک بگەین. بەڵکو پێویستە پەنا بۆ فاکتەرێکی گرنگو سەرەکی بەرین، کە ئەویش ئاماژەو زمانە لەم رێگایەوە ئەتوانرێت بە بنەمای ئەو رایەڵەدا شۆڕبینەوە(١٢٨:٩). واتە زمانی بەکارهێنان سەرچاوەی رایەڵەکانی تانوپۆی پێکهاتەی شارستانی مادیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی بەرجەستە کردووە.

### ٥. نالی لە دیدێکی سۆسیۆلۆژییەوە

مرۆڤ یەکێکە لەو بوونەوەرانەی ئارەزووی بەدواچوونو زانینی سروشتو دەورووبەری خۆیی هەیە. بە دوای ئەو هۆکارو پاڵنەرانەدا گەڕاوەو ئەگەڕێت، کە بوونەتە جێی سەرنجیو کاری لە ژیانی مادیو کۆمەڵایەتی کردووە. بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بووە بۆ ئەوەی سەرە داوی نهێنیەکانی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. نەوە دوای نەوە ئەوەندەی پێی کرابێت بیرو تێڕوانینی خۆی لە زۆر لایەنی ئەفسانەو فابێڵو باوەڕو ئایینەوە کەڵەکە کردووە، کردوونیەتە پێگەیەکی رۆشنبیری، شارستانی، کولتوورو (رۆشاک) بۆ نەوەکانی دوای خۆیانیان جێهێشتوون. لێکۆڵینەوە لە کەسێتیو کۆمەڵگە یەکێکە لەو فاکتەرانەی، کە گۆڕانکاریو پێشکەوتنی نوێ ئەهێنێتەکایەوە.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە ئەم بابەتە توێژینەوەییانە بە کردەوە دەستی پێ کردووە. گەشەی بەرچاویان بە خۆیانەوە بینیووە. لە دیارترینی ئەو گەشە کردنە: بەکارهێنانو هاتنە ناوەوەی ڕێبازی زانستیانە بووە. بۆ تێگەیشتن لە جیهانی کەسێتیو کۆمەڵگەو پەیدابوونی دژایەتی زانستی، کە گۆڕانێکاریەکی بنچینەیی بۆ بەرەوپێشچوونی دیدو بۆچوونەکانی مرۆڤ لە تەواوی لایەنە مادیو کۆمەڵایەتیەکانی پەیوەست بە ژیانی مرۆڤایەتیەوە مسۆگەر کرد. هەر لەو کاتەوە بەم شێوازو ڕوانگەیە لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا مرۆڤ کەوتە کار کردن بۆ بە دەست هێنانی زانیاریو زانست. تاوەکو بتوانێت جێی ئەو شرۆڤەو بۆچوونانە بگرێتەوە، کە لە نادیارەوە هەڵقوڵابوون. بەکارهێنانو گەشە پێدانی فیزیاو کیمیاو بایولۆژیو چەندین لێکۆڵینەوە لە زانستەکانیتردا.

هەر چەندە ئەم لایەنە لە رێوگەیەکی ترەوە گەیشتە وڵاتو نەتەوەی ئێمەو لایەنە نەێگەتیڤەکانی زیاتر بەسەر ئێمەدا سەپا، وەک لە رێوگە پۆزەتیڤەکانی، کە ئەمەیان باسێکی‌ترە. سۆسیۆلۆژیا وەک بەشێکی گرنگو دانەبڕاو لەناو زانستەکاندا برەوپێدەرو پارێزەرو هاوسەنگی نێوان رۆشنبیریو شارستانی کۆمەڵگەی بە ئاڕاستەیەکی بەرچاو بەرەو گەشە کردن برد.

هەر دوو شۆڕشی گەورەی سەدەی هەژدەو نۆزدە رێگە خۆشکار بوون بۆ ئەم زانستە. بە تایبەتی لە ئەوروپادا شۆڕشی فەرەنسا **١٧٨٩** سەرکەوتنی گەورەی بیرو بەهای زانستیو یەکسانیو ئایدۆلۆژیای لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا بە دنیادا پەرش کردەوە. بووە هەوێنو بەردی بناغەی هێزو دینامیکیەت. دنیایەکی نوێی بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی خوڵقاند. شۆڕشی پیشەسازی لە کۆتایی سەدەی هەژدە لە بەریتانیاو هەندێ ناوچەی‌تری ئەوروپاو ئەمریکا سەریهەڵدا. بووە هۆی گۆڕانکاری بەربڵاو لە جێگۆڕکێی پێگەی کۆمەڵایەتیو ئابووریدا، کە چەندین فاکتەرو شێوازی داهێنانی تەکنەلۆژیای نوێو بەکارهێنانی ئامێرو رێگە چارەی تری لەگەڵ خۆیدا هێنایە ناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە. بە رادەیەک گەشەی کرد، کە بووە هۆی دەست پێکردنی کۆچ کردن لە ناوخۆی وڵاتاندا بە هەمان شێوە بۆ دەرەوە. هەر چەند ئەم لایەنەیان فاکتەری‌تری لە پشتەوەیە بە هۆی دژایەتی کردنی سیستەمی سەربازیو سیاسیو داگیر کردنو شەڕەوە. بە شێوەیەکی گشتی بووە هۆی بەربڵاوی ناوچەی ئۆربانو نوێبوونەوەو دامەزراندنی تەرزی نوێ لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا. ئەمانەش گۆڕانی سیماو خەسڵەتەکانی ژیانی ئاسایی کۆمەڵایەتیان هێنایە کایەوە. دیارترینیان رەفتاری کەسایەتیو پەیدابوونی

بیرکردنەوەی جۆراوجۆرو بەپیرەوە چوونی بای ئەو گۆڕانکاریانە بوو، کە سەرتاسەری دنیای گرتەوە(٢٠٧:٢٣). لە ناویاندا شاری سلێمانیو لە سلێمانیشدا خانەقاکەی مەولانا خالیدی نەقشەبەندی.

ئێمە لە زۆر لایەنی لێکۆڵینەوەو بەدواچووندا تا رادەیەک هەژاری بوارەکانی سۆسیۆلۆژیا بووین بە پێچەوانەی تەنانەت تورکیا، کە مزگەوتو دیوەخانی سوڵتانو وەزیرەکان، وەک دێرەکانی ئەوروپا بوونە شوێنی گۆڕانکاریو سۆنگەی بیری جۆراو جۆری تیادا دەرکەوتن[٢٦]. گۆڕانکاریەکان لای ئێمە لە سەرەتاوە لە مزگەوتو خانەقاکانی سلێمانیو دەوروبەریەوە بۆ نەتەوە دەستی پێکرد[٢٧]. بەڵام بە هۆی هەندێک فاکتەری خۆییو بابەتیەوە بەو شێوەیە گوڕی بەخۆی نەداو سەرکەوتوو نەبوو، وەک ئەوەی چاوەڕوان ئەکرا. بەڵام کاریگەری بنەماکانی، تاوەکو ئەمڕۆ ئاشکرایە. پێویستیان بە لێکۆڵینەوەو بەدواچوونی زیاتر هەیە. ئەم لایەنە بۆ ئەو سەردەمە ئاشکرایە بەو زمانە رەوانەی، تاوەکو ئەمڕۆ نەتەوەیەک بەو داهێنانەی نالی قسەی پێ ئەکاتو پێی ئەنووسێت. بۆ ئەو سەردەمەو ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەو شاکارانەی چەندین هۆکاری گۆڕانکاری هێناوەتە کایەوە.

ئەگەر ئێمە باس لە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگە بکەین ئەوا باسێکی تایبەتو چڕو پڕی وای پێویست ئەبێت، کە چەندین تیمی سەربەخۆی تایبەتمەند تیایدا بەشداری بکات. ئەوەی مەبەستە ئەوەیە چمکێکی کورتی لایەنە کۆمەڵاتیەکانی ئەو مەزنە ئاشکرا

---

٢٦- مێژووی سەردەمی عوسمانیەکان دیارە، کە سوڵتانەکان هەموو دەست رەنگینو خوێندەوارو پیشەییەکانی وڵاتانیان هانداوە کە بۆ شاری سوڵتان ئیستانبوڵ کۆچ بکەنو لەوێ بەناوی ئیسلامەوە خزمەت بکەن، لەو هەوڵانەشیاندا سەرکەوتوو بوون.

٢٧- بڕوانە: مامۆستا جەعفەر، شاری سلێمانیو ململانێی گرووپە کۆمەلایەتیەکان، ٢٠١٤

بێت بۆ ئەو سەردەمەی بەو توانا گەورەیەی هەیبووەو ئاماژەی زۆر جۆری گۆرانکاری پێداوین. هیچی لە بۆچوونی زانایانی تری دنیا کەمتر نەبووەو لە زۆر لایەنەوە لەوان کەمتر نەبووە. بۆ نموونە بە کورتیو بە کوردی ئەگەر بمانەوێت باس لە ئیبن خەلدوونی مەغریبی عەرەبی بکەین. هەر چەندە وەک سەردەم پێش نالیە، یاخود بچینە ناو بیروبچوونەکانی سانسیمۆنو کۆنتو سبنسەرو سارتەرو ...هتد. ئەمانەو سەدانیتر، کە هەر یەکەیان لە سۆنگەی سۆسیۆلۆژیاوە بە شێوازێکی تایبەت لە ژینگەی کۆمەلایەتیو گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگە دوواون.

ئیبن خەلدوون، **١٣٣٢ـ ١٤٠٦** لە کتێبە بە ناوبانگە مێژووییەکەیدا **(المقدمة)** تەمەنی رۆشنبیری، شارستانی بە بوونەوەری زیندوو وێکچواندووە. لەو باوەڕەدا بووە یاساکانی سروشت، وەک تەمەنی مرۆڤ کاریگەری لەسەر (شارستانیو رۆشنبیری) دەکەن، وەک چۆن مرۆڤ بە پچووکیو لاوازی لە دایک ئەبێتو بە پێی سەردەم گەشە ئەکاتو گەورە ئەبێت، تاوەکو ئەگاتە رەوتی پێگەیشتنو کامڵ بوون پاشان نامەی پیر بوونو داکەوتنی پێ ئەگاتو بە مردن کۆتایی دێت[٢٨].

ئیبن خەلدوون تەمەنی شارستانیەتی لەم سۆنگەیەوە شرۆڤە کردووە. کردوویەتی بە چوار بەشەوە لە منداڵی بۆ گەنجیو لەوێوە بۆ پیریو ئینجا مردن. یاخود بەهارو هاوینو پایزو زستان. لای ئیبن خەلدوون لە پاش قۆناغی مردن ژیانەوەی شارستانیەتیەکیتر لە دایک ئەبێتەوە. بە هەمان شێوە خولی ژیان سەرلەنوێ بەردەوام دەست پێ ئەکاتەوە. هەمان ئەو رێچکەی بیرکردنەوەیە لای نالی

---

٢٨-بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالرحمن بن خلدون، المقدمة، دار التاب للطباعة والنشر، بیروت ١٩٧٩.

دەرکەوتووە لە چەند شیعرێکی شایستەدا لە زۆر لایەنەوە ئاماژەی بەو گۆڕانکاریانە داوە.

نالی نوێ بوونەوەکەی بە سەرەتای لە دایک بوون خەملاندووە. ئەو سۆنگەیەی لە وردەکاریەکی شایستەوە لە شیعرێکی ١٥ بەیتیدا ئاماژە پێداوەو ئەڵێت:

**گەرمی و تەڕیی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە**

**پشکۆی گوڵاتەشین بە نەسیم بوو گەشایەوە**

**لالە کە مەجمەرێکە بە با خۆش و گەش دەبێ**

**ناوی کە پڕ خەڵووزە بە شەبنم گەشایەوە**

**گوڵ زاری وا ، کەهەرچی دەمێکی بو پێکەنی**

**غونچەی گەشا کە یەعنی دڵ کرایەوە**

**فەصڵێ هەر لە فەرقی بەشەر تا ڕەگی شەجەر**

**وشکی بە غەیری صۆفی یو عاصای نەمایەوە**

**لەم فەیضی نوورە هەرچی کەوا نارە مردووە**

**بەم نەفخی صوورە هەرچی کە خاکە ژیایەوە**

**هەنجیری ئەو شکۆفە کە پڕ بوو لە شیری صاف ،**

**طیفلی عینەب شکۆفەیی کرد و ڕشایەوە**

**دایەی زەمین کە حامیلی ئەبنایی مەحشەرە**

**هەر تۆوێکی تیا کە ئەمانەت بو ، دایەوە**

**سونبول لەبەر ڕووعوونەتی شمشادی تازەدا**

**هات و بە طەعن و دەورە بەسەریا شکایەوە**

خەضرا ، دەڵێی زەمینە بە (چین) و (خەطا)یەوە

غەبرا ، دەڵێی سەمایە ، بە شەمس و سوهایەوە

(البرد الجوز)ەیێکی کە نەیبوو بە غەیری بەرد

دنیا ئەمە چ ڕەنگە ، چ بێنێکە دایەوە !

غەیری تەڕیی حەرارەت نوما ، نەما

بەفریش لە سەرد و گەرمی خەجاڵەت توایەوە

هەر چاوەڕێی کە وشک و عەقیمی بوڵندییە

وەک طبعی من بە نەضمی خۆشی نەغمە زایەوە

صاف و ڕەوان و نەرمە وەکو زەمزەمەم و فورات

نەک ڕەنگی نیلە یەعنی کە هات و گەڕایەوە

صۆفی ڕیایە خەڵوەتی ، بێنی بەهاری کرد

هاتە دەر ێ لە سایەیی چایەر ، حەسایەوە

((نالی)) بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر

بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە صەد داوی نایەوە(٥٤٨:١٤_٥٥٥)

لەو شاکارەدا هەموو ئاڵوگۆڕو گۆڕانکاریەکانی ئاماژە پێداوە. وەک لە بەشەکانی پێشودا ئاماژەمان پێدا نالی باوەڕی بەوە هەبووە، کە زانستی بەرفراوانو زانیاریو بیر ڕۆشنی خۆی بنەی دامەزراندنی شارستانیەتن. لەم ڕوانگیەوەیە هاتووەتە سەر دیاری کردنی ئەم لایەنە. مژدەی نۆژەن بوونەوەو لە دایک بوونێکی نوێ دەڵێتەوە. لە شاکاری لاپەڕەی ٢٠٤-٢١٨ ی دیوانی نالیدا دیسانەوە هەر دوو وەرزەکەو سەرەتاو کۆتایی ژیانی بە ڕوونی ئاماژە پێداوە.

نالی ئەم تەرزە بەراوردەی لە وشەکانی زمانەوە بەرجەستە کردوون. ئەگەر بە وردی سەرنجیان لێ بدەینو لە کرۆکی واتاکانەوە بەرەو ژیانە کۆمەڵایەتیەکە هەڵکشێین. ئەبینین لە دوو بەشی سەرەکیدا، کە:

**یەکەمیان** بەکارهێنراو.

**دووەمیان** وێڵک راووە (مهمل)،

مانای جیاوازی لەم دوو بەشەدا دەرخستوون. وێڵ کراوەکان ئەوانەن، کە نەبوونەتە ئاماژە، نەک بەو واتایەی لە بنەڕەتدا واتای گوزارشی هزرییان نەبێت. بەشی یەکەمیان بەکارهێنراوەکان، کە لە رەوتێکی ئاماژەیی زیندوودان. ئەم لایەنە وشەو دەستەواژەی زیندوون نەک تەنها لەبەرئەوەی لە رووی زمانەوانیو کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەوە نوێو داهێنراو بوون، بەڵکو نالی توانیویەتی بیرو بۆچوونەکانی خۆی لەو شێوە گەشە کردنەدا بە شرۆڤەی رسکانی کۆمەڵایەتیو شێوازی پەروەردەو بیری کۆمەڵایەتیەوە بلکێنێت. ئاماژەکان ببنە پەنجە خستنە سەر رەوتێکی دیاریکراو. واتای کۆمەڵایەتی لە خۆیاندا کۆبکەنەوە. هەر ئەمەشە وایکردووە، کە شاکارەکان خۆیان رووبەڕووی راستیە کۆمەڵایەتیەکان ببنەوەو واتا بە ژیانی کۆمەڵایەتی ببەخشنو بە داهێنان ناوزەد بکرێن.

لای بیرمەندی بەناوبانگو دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژیا ئۆغست کۆنت **١٧٩٨ـ١٨٥٦** هەمان ساڵە، کە بۆ لە دایک بوونو مردنی نالی‌یان داناوە. ئۆغست کۆنت قوتابیو هاوڕێی سانسیمۆنی بیرمەند بووە. گەشەی کۆمەڵگە بە سێ سەردەم باس ئەکات، لای ئەم بیرمەندە بەناوبانگە ئەو سەردەمانە بریتیین لە (لاهوتو میتافیزیکیو زانستی). ئۆغست کۆنت هەوڵیداوە زانستێکی نوێ بۆ کۆمەڵگە بەرجەستە بکات

واژەی یاسایی بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی بهێنێتە کایەوە، وەک چۆن لە ژیانی سروشتیدا هەیە.

لای ئەم بیرمەندە **لە سەردەمی لاهوتیدا** بیرکردنەوەی مرۆڤ پەیوەستبووە بە بیرو بۆچوونی ئایینیەوە. مرۆڤ لەو باوەڕەدا بووە کۆمەڵگە جگە لە ئیرادەی خوا هیچیتر نییە. ئەم لایەنە بە هەمان ڕەوتی بیرو زانستی نالیەوە بەدی ئەکرێت، بەڵام شێوەی شرۆڤەو دارشتنەکەیان جیاوازی ئاسمانو ڕێسمانە. بۆ ئەو لە وڵاتێکی ئەوروپی لە ناو نەتەوەیەکی خاوەن رسکانو سیستەمی کۆمەڵایەتیو برەوەدەری یاساو دەستگری زانستدا. بەرامبەر بە زانایەک، کە لەبن بەردو ناو حوجرەی نیمچە کەلاوە بخوێنێ ئەبێ ئەو جیاوازیەش چاوەڕوانکراو بێت.

لە یەکێ لە بەیتە نایابەکانیدا بە توانایییەکی بیری زۆر فراوانی سنوور بەزێنەوە توانیویەتی ئەو شێوە نامەیە بگەیەنێت، هەموو بابەتەکان ئەداتەوە دەست خواوەند ئەڵێت:

**واقیف بە هەرچی کەتمی خەبایایی ماضییە**

**عالیم بە هەرچی دێت و دەبێت و موقەددەرە**(٤٢٩:١٤)

**لە سەردەمی میتافیزکدا**، بیرو بۆچوونی مرۆڤایەتی پەرەی سەندووە. بەتایبەتیش لە سەردەمی ڕێسانسو بە دوا، کە خەڵکی لە سۆنگەیەکی سروشتیەوە سەیری کۆمەڵگەیان کردووە، شرۆڤەی سروشتیان بۆ بوارەکانی گەشەو پێشکەوتنو گۆڕانکاری هەبووە.

ئەم لایەنە لای نالی وەک ئەو ئاماژەی پێداوە ئەمیش لە بیرو بۆچوونی خۆیەوە ئاشکرای کردوونو ئەڵێت:

**چەن واسیعە ئەم ذیهنە ، ئەفلاکی تیا ڕەهنە**

**ئەجبالی لە لا عەیهنە ، ئەدواری لە کن پەشمە**

**((نالی)) کە قەدەح نۆشە ، مە ستانەوو سەرخۆشە**

**خامۆش و نمەدپۆشە ، ئەشعاری لەکن پەشمە**(٤٧٦:١٤-٤٧٧)

ئەو بەرفراوانی هزرو شارەزاییەی سەردەمەکەی بە هەمان شێوە بۆ سروشتو گۆڕانکاریەکانی گواستونەتەوە لە شیعرێکی نایابدا لە باسی بەهارو گۆڕانکاریە سروشتیە هەست پێکراوەکاندا جیاوازیەکان دەست نیشان ئەکاتو ئەڵێت:

**دەس بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن**

**صاحێب کولاە و سایەو و بەرگن وەکو مولووک**

**کانی دەزێن بە ئاو و ، درەخت ئاوسن بە با**

**شایی بەهارە ، بولبولە داماد و خونچە بووک**

**وەک چاوی وشکە صۆفییە کانی لە دار و بەرد**

**دەدرێن بە صەد تەرەننوم و گریان و نووکە نووک**(٢٥٧:١٤-٢٥٩)

لێرەوە هەست ئەکەین کە سروشتی بەرفراوانی بیری خۆی تێکەڵی ژیانی کۆمەڵایەتی باوی سەردەمەکە کردووە. لەگەڵ گەشە کردنەکەدا ئەمیش داواو هەنگاوی پێشکەوتنی هەیە.

**لە سەردەمی زانستیدا** ئاشکرایە مرۆڤ وابەستەی ئەو داهێنانو دۆزینەوانە ئەبن، کە لە بوارە مادیو کۆمەڵایەتیەکاندا خزمەتی ژیانی مرۆڤایەتی ئەکەن، وەک ئەو داهێنانە زانستیانەی زۆر لە زانایانی داهێنەری وەک نیوتنو ئەنیشتاینو داروینو... هتد بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی بە دەستیان هێناوە. هەر ئەو پابەندیە زانستیەشە بۆتە

هۆی ئەوەی شێوازی زانستی لە نووسینو بیرو بۆچوونو بەراوردو دارِشتندا پراکتیزە بکرێتو لە هۆنینەوە دووربخرێتەوە. ئەم بارە لای نالی بەو رادەیە پێنەگەیی. بەڵام درکی بەوە کردووە، کە شێوازی بینینی رەفتارو مرۆڤایەتیو زمانو جەستەو هەوڵدان، بەردەوام بوون ژیان بۆ کۆمەڵگە مسۆگەر ئەکات. ئەمانە خۆیان بنەمای پێگەشتنو گۆرانکاریو هەنگاوی شیاو لە بەرەوپێش چوونی کۆمەڵگەدا بەرجەستە ئەکەن. جگە لە چەندین شرۆڤەی جیاوازی بەیتێکی نالی لەم بارەیەوە، کە ئەڵێت:

**بەندە ئەزەل بە خەططی خۆی قابیلی قیسمەتی بووە**

**ئێستە بە ئیقتضای عەمەل جێگەیی خۆی طەلەب دەکا**(٩٨:١٤)

ئەم مەزنە بیرکردنەوەی بەراورد کردووە بەو رەوشەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی لەسەر شرۆڤە ئەکرێتو نالی ئەیانناسێنێت. هۆکاری گۆرانەکاریەکان ئەبزوێنێت شوێنی خۆیی تیادا ئەکاتەوە، تاوەکو ئەو کاتەی بۆ ناسینو تێگەیشتنی بنەمای بابەتە کۆمەڵایەتیەکان داوای بیرکردنەوەو بەدواچوونی زیاتر بکات.

شۆڕبوونەوە لە مەبەستی شیعرەکانی نالی ئەمانگەیەنێتە ئەو رایەی وەک یەکێک لە فەیلەسوفە یونانیەکان، کە ئەڵێت (دووجار بە ئاوی روبارێکدا ناپەڕییتەوە).

نالی ئەیەوێت هەمان مەبەست بۆ ئێمە ئاشکرا بکات، چونکە مرۆڤ خۆی خەریکی تانو پۆچنینو بناغەی کامەرانیو خۆشیو بونیادنانە. کەواتە وەرن سەیر بکەن چونکە ئاو بەردەوام ئەڕوات. تاوەکو بێت تانوپۆی بونیادو پێگەکانی خۆی بەرفراوانتر ئەکات. ئاواش پێویستە مرۆڤ خۆی بناغەی بونیادو چەسپاندنی خۆی دارِێژیت، دەنا هەموو ئەو هەلانە لەکیست ئەچن.

نالی ئەو کاتانەی ئەرستۆ ئاسا (خۆت خۆت بناسە) یان وەکو دیکارت (من بیر ئەکەمەوە واتە من هەم) ی خستۆتە بواری پراکتیزە کردنەوە، کە لە هەمان سنووری هزری ئەواندا دایناون. ئەم بیرمەندە وەک جوڵانەوەیەکی میکانیکی لە جموجوڵو چالاکیەکانی مرۆڤو ئاژەڵی روانیووە. تیۆرێکی بەرجەستە کردووە ئەڵێت: ((هەموو جوڵەیەک لە هزرەوەیەو پاشان دەبێتە فاکتەری جوڵانەوەی راستەقینە)) بەوەی بیری هزرمەندانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ بوونی خۆی ئەسەلمێنێتو لە بابەتێکیترەوە درکی بابەتیانەی نوێی بۆ ئەسازێت(١:٣٢٠).

نالی هەمان ئەو هەستەی ئەوانی هەبووە. لە رێگای چەندین شێوە بابەتی کاریگەرو پاڵەپەستۆی خانەو وێستگەکانی بیرو هۆشەوە هەستی وابەستەی دنیای دەرەوەی خود کردووە، لەو سەرچاوە سەرەکیەوەی، کە ناونراوە هزر. هەر ئەم روانگە فەلسەفیەیە نالیمان بۆ ئەخاتە ناو ئەو هاوکێشەیەی، کە هەمیشە بابەتەکان لە بیری هزرمەندانەو دەروونی تاکەکەسەوە سەرچاوە بگرنو خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکان لە خۆیاندا کۆبکەنەوە. ئەو بابەتانەی نالی باسیان ئەکات ئەو لایەنەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، کە بیری کۆمەڵایەتیو جەستە دوو رەوتی تەریب دروست ئەکەن. نالی بۆ دەرفەتێکی تامەزرۆ گەڕاوە، کە بیاندرکێنێت. تاوەکو بتوانێت لێککەشتنو خۆ گونجاندن بە شێوازێک کە نالی خۆیو وڵاتیش هێلانەی لە ئاسمانو رێسماندا پێ نەکات. ئەمە جگە لە روانگەیەکی گرنگ لە شێعرەکەدا، کە بریتیە لە نامۆبوونی بیر. ئەڵێت:

**نەفەس هەروا لە رێدا دێت و نایێ**

**لە سەیرو مەیری ئەسبابی سەفەرمام**

دەمێکە وا لەسەر پێیەک دەسوتێم

لە شەوقی تۆ بە میثلی مۆم و ، هەر مام

وەرە قوربان ! بە جان هەردوو برا بین

کە تۆ بێ مادەر و من بێ پودەر مام

لە(دار العلم) ی تەحصیلی مەعاریف

وەکو ((نالی)) جەهول و بێ خەبەر مام(١٤: ٢٦٣ ـ٢٦٤)

هەندێ لایەن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێچەوانەی رەفتاری تاکەکەس ئەبێتەوە وەک خراپی باری ئابووری، یان کاریگەری باوەڕی ئایینی ...هتد ئەمانە مرۆڤ تووشی تێکوروژان ئەکەن. رێگەو پێگەی بیرکردنەوەی هزرمەندانەو رەفتاری ئاسایی دیاری ئەکەن. یاخود پەیدابوونی ئەو تێکوروژانانەی وابەستەی دەری ژینگەی مرۆڤە کاریگەری راستەوخۆو ناڕاستەوخۆی هەیە. راستیە کۆمەڵایەتیەکان ئەخەنە دەرەوەی توانای تاکەکەسو چێژ لەو تواناکانی وەرناگرێت، کە لە بۆچوونو بیرەوەریەکانی ژیانی مرۆڤدا بنەیان داکوتیووەو بوونەتە خەسڵەتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ خۆی(٢٩). ئەو کاتانەی راستیە کۆمەڵایەتیەکان لە بیرو بۆچوونو دەروونی مرۆڤدا کەڵکە ئەبێت هەستی خۆ بە شت زانینی لە لا دروست ئەکات. ئەو کاتانەشی مرۆڤ بکەوێتە وەهمو چەواشەوە ئەوە تووشی تێکوروژانو تەنگەژە ئەبێت.(١٧٩:٣) ئەم سۆنگەیە لە چەندین شاکاری نالی‌دا وەک ئەستێرە ئەدرەوشیتەوە. لە بەیتێکدا ئەڵێت:

---

٢٩-خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکان ئەوخەسڵەتانەن، کە دەسەڵاتی خودی تاکەکەس پیادەیان دەکات

**عاشق هەوەسی مەیکەدەوو علمی بەسیطە**

**عاقڵ طەلەبی مەدرەسەوو جەهلی مورەککەب**(١٣٥:١٤)

لە بەیتە شیعرییەکەدا هەست بە تێکوروژانەکە ئەکرێت، کە نەزانی ئەیەوێت شوێن بە هزرو بیری بەرفراوان لێژ بکات. هەر بۆیە خۆی پێناسە دەکات، کە هەرچی راستو درووستە من ئەلێمو ئەینووسم.

نالی لە دەری سنوری پابەندبوونەوە هەستی بە رەوتی ئەو گۆڕانکاریانە کردووە، کە پێویستی بە باسکردن هەیەو بە کردەوە کۆمەڵگە بەرەو گۆڕانکاری راپێچ ئەکەن. تاوەکو رەوتی بیرکردنەوەو رەخنەی بونیادنەرانەی لەسەر کەڵەکە بێت. مرۆڤ بە ئازادانە بتوانێت خۆی پێناسە بکات. نالی لەو شێوە بانگەشە ئازادەی خۆیدا ئەڵێت:

**مەشرەبی ((نالی)) گەلێ ئابی‌یو ترشە ، بەڵێ**

**موعتەریفە خۆی دەڵێ : چا نییە ئەطواری من**(٣٣٦:١٤)

ئەگەر هەر بابەتێک پابەند بێت بە ئازادیەوە یان فاکتەری دروست بوونی تەنگەژەو دابڕانی تاکەکەس بێت لە باس‌وخواسی بێ کردەوەییدا، ئەوە شێوازە پێچەوانەکان زیاتر دەرئەکەون. ئەو هەولانەی بە ئازادی راستەقینە پراکتیزە ئەکرێن ئەو هەولانەن، کە شێوازو بیرو بۆچوونو رەفتاری زۆربەی کۆمەڵگەکەیان تیادا پیادە ئەکرێت، لەوانەیە لە زۆربەی کاتدا راستیە کۆمەڵایەتیەکان ببنە هۆی سنوردار کردنی کارو تواناو لەگەڵ خۆیاندا مرۆڤیش سنووردار بکەن. تاوەکو لە شاڵاوی سزای دەستکردی کۆمەڵایەتی داڕێژراوەوە دووربن. هەر ئەم فاکتەرەیە تاوانو رەفتاری نا کۆمەڵایەتیو لێک نەگەیشتنو بەکارهێنانی هێزو توندوتیژیو

خراپەکاریو زمان زبری پەیدا ئەکەن. نالی ئەم بابەتەی لە شیعرێکدا باس کردووە پێمان ئەڵێت:

**خوانی ذی شانی جیهان هەنگی خۆشاهەنگە ، وەلێ**

**مێشی دەم نۆشم و، دوم نێشم و، عەکسی عەسەلم**(٢٩١:١٤)

بەرفراوانیو هاوسەنگی دینامیکیەتی هزرو بیری نالی لەو روانگەیەوەیە، کە وایکردووە بێت هەنگ هەڵبژێرێت، چونکە هەنگ زیندەوەرێکە شێوازی گەیاندنو ئاگاداری دەسەتەو گروپی خۆیانی تیایە. تاوەکو ئێستا زۆر بابەتی نهێنی هەیە لە ژیانی هەنگدا نەزانراوە، یەکێک لەوانە ئەتوانێت ئاگاداری هەنگەکانیتر بکات، کە کام جۆرە شیلە لە سەر کامە گوڵ هەیە. بە شێوەیەک، کە رووی ماوەو خێرایی هێنانەوەی شیلەکەشی دیاری کردبێت[٣١]. نالی هەمان سۆنگەی جوانی ئاماژە پێداوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەو گەورەییو لەخۆ رازیبوونەیەوە ئاگاداری ئەوەمان ئەکات چزو دارو ئازاراوییە. لێرەدا ئەو شێوە قسە کردنە بە ناوی خودەوە لە خانەی بیری هزرمەندانەو بەرفراوانی زانیارییە کۆمەڵایەتیەکانەوە ئەو بابەتە وابەستە ئەکات بە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە میکانیکیە باوەکانی کۆمەڵگەوە. مەبەستێتی لاوازیو کەم توانایی کرۆکی پەیوەیەندیەکان بجوڵێنێو ئەرکی ئۆرگانی دابەشکردنو فرمانو کاریان بۆ بەرجەستە بکات. هەر ئەوەشە وای لە نالی کردووە، کە لەسەر خوانی هەنگوینی زانستو زانیاری کۆیان بکاتەوەو داوای شوێنی شایستەی خۆی بکات.

لە کۆمەڵگەی میکانیکیدا کارەکان وابەستەی هەموانن. رۆڵی تاکەکەس رۆڵی گشتە. هەر ئەمەشە وای لە نالی کردووە تاوانو ئاشووبنانەوە لە پڕ بوونی بێزراوی

پەیوەندییە میکانیکییەکانەوە بکاتە راستیەکی کۆمەڵایەتیو بانگێشتی خۆ لادانو گۆڕانکاری بۆ بکات. لەیەکێ لە بەیتەکانیدا ئەڵێت:

**موطمەئین خاطر و ئەیمەن مەبە هەرگیز لە شەڕێ**

**نەفسی ئەممارە ، کە ئەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕییە**(٥٨٦:١٤)

هەندێ جاریش بە شێوەیەک خۆی دەرئەخات، تاوەکو رەنگو بۆی کۆمەڵگەی لێ نەشوێتو توشی ئاڵۆسکانی دەروونیو کۆمەڵایەتی نەبێت. لە هەمانکاتیشدا راستیە کەڵەکە بووەکانی تاکەکەس بکاتە رەفتارو پیشانی کۆمەڵگەی بدات. بە مەبەستی جوڵاندنی ئەو وەزیفانەی پێشتر ئاماژەی پێدرا.

نا دیاریو چەواشە کاریو نەزانینو خەیاڵ پلاویو خەڵەتاندنی خەڵکو کۆمەڵگە بە شێوازێکی ناپاب دیاری کردووە. راستگۆو ئازاو بێ ترسە لە دووڕوویيو خۆ دەرخستن. هەر ئەمەیە وای لە نالی کردووە بیمنەت لە ناو خەڵکیدا بڵێت:

**((نالی)) کە ویقاری نیە، بێ باکە لە خەڵقی**

**سۆفی، کە سلوکێکی هەیە ، عوجب و ریایە**(٥٦٥:١٤)

بابەتی ئاینی جۆرێک بە ژیانی کۆمەڵایەتیەوە ئالاوە، کە بیرمەندانو زانایانی بوارە مرۆڤایەتیو سۆسیۆلۆژەکان نەیانتوانیووە پێناسەیەکی کۆگیری رۆشن بۆ ئایینو لکو پۆپەکانی دابنێن. نالی وەک ئەو بیرمەندانە زۆر بواری ئایینی باس کردووە. تێروانین لە بەرهەمەکانی نالی لە رووی ئایینیەوە بریتیین لە پەیوەندیەکی تاکەکەسی لە نێوانی دڵو دەروونی خودو خوادا، تاوەکو ئەو کاتەی باوەڕی ئایینی مژدەی ژیانو خۆشەویستیو چێژی ژیانێکی ئاسودەیتری ئەزەلیت پێ ئەبەخشێت. ئەم رایەش لەگەڵ زۆر لە ئایینە ئاسمانیەکانیتردا یەک ئەگرێتەوە. رەتکردنەوەی

ئەم بۆچوونە پەیوەستە بە پێگەو رادەو ئاستی رۆشنبیری ئایینی کۆمەڵگەوە. چونکە هەندێ رەوتی ئایینی وا پەیدابوون لە هیچ قوژبنێکی ئاییندا نایان دۆزیتەوەو لە هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیدا نەبووەو نییە. نالی هەوڵیداوە رووە رەسەنەکەی ئایین پێشانی کۆمەڵگە بدات، کە بریتییە لە کردارێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ، کە هەوڵی پارێزگاری کردنی یەکانگیری پۆزەتیڤی کۆمەڵگە بدات. تاوەکو ئاسودەیی‌و ئارامی لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا مسۆگەر بێت، هەر ئەو باوەڕو رێبازە ئەتوانێت یارمەتی مرۆڤ‌و دەوروبەرەکەی بدات، کە بەردەوام لە پەنا باوەڕدا هەست بە بوونی خۆیان بکەن[٣٠]. ئەم مەزنە مرۆڤەی کورد متمانەی کردۆتە سەر پێگەیاندن‌و پێش خستنی هەڵوێست‌و بیرکردنەوە سەرەکیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی راستەقینە. ئاشکرا لە چارەسەری لایەنە کۆمەڵایەتیەکاندا بە پێودانگێکی ئۆرگانیزمانە بەراوردی کردوون.

ئەتوانین بیری نالی لە رووی پێشکەوتنەوە بە بنەمایەکی راستەقینەوە ببەستینەوە، کە بەردەوام بوون لە یاسایەکی ئەزەلی سنوور بەزێنەوە (زانستیەوە) سەیر بکات، بەو پەڕی باوەڕەوە بەردەوام شانی‌دابووە بەر ئەو رێچکەیەو بەرهەمی نوێی لێ داهێناوون. مرۆڤ بە چرکە لە گۆڕاندایە. هەندێ جار ئەو بیرکردنەوانە مرۆڤ لە خەڵوەت ئەنێ‌و هەندێک جار تووشی خەمۆکی‌و دڵەڕاوکێی ئەکات. نالی بە بیرێکی هزرمەندانەوە بەراوردی ژیانیان پێ ئەکات. وەک لەم پارچە شیعرەدا دیارە، کە ئەڵێت:

---

٣٠- وەک ئەو نامەیەی بۆ نوری رووبادی نوسیووە یان بۆ صفای شیرازی یاخود لە پارانەوەکەیدا لە حەج، خوێنەر ئەوانێت بە شاکارەکانیدا بچێتەوەو ئەو رەوتی ئایینەی تیا گوڵچن بکات.

بنواڕە  وشکە صۆفی‌یو ڕەقصی بە هەلهەلە

دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە

ئەم ئەرضە مەزرەعەی عەمەلە و گوڵخەنی ئەمەل

هەندێ بووە بە مەسجد و ، هەندێ بە مەزبەلە

شێخم ، چ گەرمە حەڵقەیی ذیکرت بە ڕەشبەڵەک !

حاڵی ئەمانە خۆ بە جەنابت موحەووەلە !

دایم لە دووتە مێگەلی ژن ، نێرگەلی پیاو

بەم ریشەوە لە پێشەوە بوویی بە سەرگەلە

دنیا مەحەللی کەون و فەسادێکە ، حیز و دوودن

مەعلوومە چەن بە حیلەیە ، عەییارە ، چەند دەڵە !

تۆ شێخ و ئەو عەجوزە ، عەجەب دۆستی یەکترن !

بێ شاهید و نیکاحە دیارە موعامەلە ..

((نالی)) سەرت لە گۆبەندەکەی خانەقا دەکا

لاێ پڕە لە مەشعەلە ، لایێ پڕە لە مەشغەلە.. (١٤: ٤٦٦ ـ٤٦٩)

هەردوو لای وەک بەراورد ئاماژە پێداوە بۆ بەلاوەنانی پۆخڵەواتەکان ئەگەڕێ. کەچی لە پاڵ ئەو سەرقاڵیو بەراوردە هزرییە جوانەدا لە بیری نەچووە، کە دنیایەکی پڕ روناکیو خۆشەویستیو عەشقی راستەقینەی ژیانو مرۆڤ لە بەرۆکمان بداتو بمانخاتە سەماو گۆرانیو تێرامانی جوانو نۆژەنبوونەوەی ژیان. ئەمەش لادان لە رەوتی خودی ئایین نییە چونکە گۆڕانکاری لای نالی یاسای ژیانە. لەو پەڕی سەرقاڵیو بیری جواندا ئەڵێت:

**پەرچەمی ڕوو دادەپۆشێ ، پێچی زولفی پێچەیە**

**دا بە ڕۆژیش پێیبڵێن شەمعی شەبوستانی هەیە**

**ئاسمانی حوسنی مەحبووبم لە ئەبرۆ و زولف و ڕوو**

**دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە**

**هەر لەبت ، یا سینەشت هەردوو بەدەرخە ، دا بڵێن :**

**لەعلی ڕوممانیی هەیە ، یا لەعل و ڕوممانی هەیە**(١٤:٥٧٣-٥٧٥)

هەموو ئەو بابەتانەی ئاماژە پێداوە، کە لە ڕوانگەیەکەوە دەستکردی خالقن‌و بە پەچەو عەبا دائەپۆشرێن. لە هەمان کاتیشدا نالی لە ئایەتی (فأما بنعمت ربک فحدث) بنەی گۆڕانکاری بۆ دائەڕێژێت، کە پێویستی بە شاردنەوە نییە.

گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی کردارێکی بەردەوامە لە بوونی کۆمەڵایەتی خۆیدا لە دوو ئاستدا دەرئەکەوێت:

**یەکەمیان** سەردەم، کاریگەری فاکتەری خۆیی‌و بابەتی گۆڕانکاری شایستە دیاری ئەکات.

**دووەمیان** کەسایەتی‌و جۆری ڕۆشنبیری، شارستانی مادی‌و کۆمەڵایەتی باو. جموجۆڵی بیری هزرمەندانە تەرزی تێڕوانین لە ژیان‌و پلەو ڕادەی کرانەوەی پەیوەندیەکانە، کە هێزو پێزو ڕیزی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و توانای گۆڕانکاری دیاری ئەکەن. لەم دوو ئاستەوە چەندین بابەتی سیاسی، خۆشەویستی، ئابووری‌و ...هتد لێ پەیدا ئەبێت. بواری پەسەند کردن‌و بەلاوەنانیش لە خۆ ئەگرێت. هەرئەم ڕەوتەیە بوونی لایەنە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکانی تریش دیاری ئەکات.

ئاستی ماریفەتی نالی لەم رووەوە بە رادەیەکە لێوان لێوبووە، رژاوەتە سەر کۆمەڵگەو رەنگدانەوەیەکی گشتی هەبووە. لەناو مزگەوتو خەڵکیدا باسیان لێوەکراوە. لە شاکارێکی پڕواتای داهێنەرانەدا کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە هەمان راستی ئێستاشمان بۆ ئەسەلمێنێتو ئەڵێت:

**رەوغەنی دیدەم رژایە سەر کیتابی خەطی خۆم**

**چاو لە ئێشی ئەو سپی بوو خۆریش بەسەر ئەودا سەقەط(٢٤٤:١٤)**

ئەم لە کاتێکدا لە گەیاندنی ئازایەتیو ئازادیو مرۆڤ لە کۆمەڵێک بابەتی پابەند بوونی مادیو کۆمەڵایەتی درێغی نەکردووە. لە هەموو شاکارەکانیدا مرۆڤی بەرز نرخاندووە، کە لەگەڵ سەردەمەکەیدا هاوسەنگی ون نەکات. بۆیە، تاوەکو ئەو تەمەنە کە لە شیعرەکەدا دیارە ئێستا فرمێسکەکان گەوهەرنیین وەک لە پێشتردا لە هەرەتی لاویدا نرخاندوونی:

**بەو گرییەی تۆیە رەنگە منیش هێندە بگریم**

**گەوهەر بڕێژم بە بوڵندی قەدو باڵات(١٣٩:١٤)**

هەر ئەو تێروانینە بەرفراوانە هزریو کۆمەڵایەتیە بەراوردکاریو تێگەیشتنە بووە وایکردووە مێژوو بە زیندویەتی رابگرێتو بە کردەوە بەشداری هەڵسەنگاندنی بکات. رەوڵەتی مێژوویی وەک ڤالیایەکی(ئیرادەیەکی) گرنگی بەهێز پێشان بدات، کە مەبەستی ژیانو بەردەوامی تێدا بێت. راستی ئەم روانگەیە لای نالی لە شاکارە مێژووییەکەیدا کە بۆ سوپای بابانەکانی وتووەو ئەڵێت:

**ئەم طاقمە مومتازە کەوا خاصصەیی شاهن**

**ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**

صەف صەف کە دەوەستن بە نەظەر خەططی شوعاعن

حەلقە کە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن

نەرگس نیگەهـ و ساق سەمەن ، کورتە بە نەفشەن

موو سونبول و ، ڕومەت گوڵ و ، هەم لالە کولاهن

گوڵزاری دەر و دەشتن و غیلمانی بەهەشتن

ئاهو صەف و ، ئاتەش بەکەف و ، تیز نیگاهن

صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن

قامەت شەجەر و ، مەظهەری ئەڵطافی ئیلاهن

گەهـ طاوس و ، گەهـ کەبکن و ، گەهـ بۆقلەموونن

گەهـ ئاتەش و ، گەهـ شوعلە ، گەهێ دودی سیاهن

لالەن بە بەدەن ، ئەطڵەسی ئەخضر کە لەبەر کەن

نەوڕەستە گوڵن ، لەگەڵ دەستە گیاهن

تەنهایی سەمەن بەرگی بە نەوشە کە لەبەر کەن

وەک نووری دڵی موئمین و ظولماتی گوناهن

بۆ سەیری خەرامێدەنی ئەم سەرو قەدانە ،

صوفی لە طەلەبدان و ، هەموو سالیکی ڕاهن

بۆ زولف و ڕۆخ و ئەبرووی چون زولفی سیاتان

عالەم وەکو ((نالی)) هەموو با ناڵەوو یاهن

((نالی)) بەخودا حەیفە دەرەنجێنی دڵی خۆت

ئەم طاقمە مەخصوصە هەموو صاحیبی جاهن (١٤: ٣٤٠-٣٤٥)

جگە لەو ڤالیا (ئیرادە) بەهێزەی باسمان کرد، ئەوە لە کۆی گشتی پارچە شیعرەکەدا ئەتوانرێت دابەشکردنی کۆمەڵگەی تیادا ببینرێتەوە، کە لە سەرەتاوە بە ئاسایی گەشەی کردووەو لەگەڵ پێشکەوتنیدا جۆرێک ئاڵۆسکانو تایبەتمەندێتی تیادا دەرئەکەوێت. وەک بیرمەندێکی کۆمەلایەتی هەولیداوە هەموو بابەتەکان بەو بوارانەوە پەیوەست بکات، کە کەمترین بەرهەڵستی بەرەو ڕووببێتەوەو گەورەترین هەولی راکێشانی تیادا بەرجەستە بێت. ئەم بوارە تایبەتمەندیە تایبەتە بە رەوشی گەشەی کومەڵگەوە. نالی توانیویەتی بە شێوەیەکی سۆسیۆلۆژیانە بیانخاتەڕوو بە پێی ئاستی ئەو گەشەو گۆڕانکاریانەی لەو سەردەمەدا هەنگاویان بۆ نراوە.

جگە لەم بابەتە نالی توانیویەتی لە رەنگدانەوەی کەڵکە بوونی ئەو مەبەستە مێژوویيانەوە  لە کۆچی دوایی پاشایەکدا ئاماژەیەکی گرنگی مێژوویيو کۆمەلایەتی کۆمەڵگە لە سەردەمێکدا ئاشکرا بکات، کە تاوەکو ئەمڕۆ بووەتە بەڵگەی مێژوویەکی دیاریکراو، کە ئەڵێت:

**تا فەلەک دەوری نەدا – صەد کەوکەبی ئاوا نەبوو**

**کەوکەبی میهری موبارەک طەڵعەتی پەیدا نەبوو**(٣٧٠:١٤)

نالی درکی بەوە کردووە، کە ژیان تەنها بریتی نییە لە سیاسەت! هەرچەندە زۆر لە شاعیرە عەرەبو بێگانەکان لە دنیادا ئەگەر بۆ ئێستا سەیریان بکەین سیاسی نەبوون، بەلام دەوڵەتو نەتەوەکانیان کردویانن بە ناسنامەی نەتەوەیی. لە ناویاندا هەیە عەرەب نینو بوونەتە رەمزی نەتەوەی عەرەب. هەر ئەوەندەیە بە عەرەبی نووسیوویانە.

نالی ئەو مۆرکی بێگانە نووسینەی لە نەتەوە کردەوە، تاکو بە زمانی رەسەنی خۆی بنووسێت. ئەمە خۆی لە خۆیدا بنەمایەکی سیاسییە. هەر ئەو هەوڵانە بناغەی سیاسەتی راستەقینە دائەڕێژێتو ئەیانکات بە بنەمای نەتەوەیی‌و بە شانازیەوە پەرەی پێ ئەدات. ئەو سەردەمەو پێش ئەویش زۆر شت روویاندا. عەبدولڕەحمان بەگی بابان بەهۆی هاتووچۆو نزیکی لە بنەماڵەی شای ئێرانەوە ئاگاداری هەواڵەکانی دنیا بوو. هەستی بەو گۆڕانکاریانەی دنیا کردبوو، بۆیە لە هەوڵی هەژاندنی لانکەی بیری کوردایەتیدا رۆڵی بەرچاوی گێڕا. بەڵام چەند شتێکی ناجۆرو ناوازە بەردەوام لە ناو ژینگەی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەی کوردا روویاندا لە چەندین بواری مادی‌و کۆمەڵایەتی‌و زانستو وشیاری خۆییەوە، کە بوونە لاوازی قەڵەمڕەوی بابان‌و تەنانەت ئیمارەتەکانی تری ئەو سەردەمەی کوردستان[٣١] هەرچەند پاشای بابان لە هەوڵی دروست کردنی مزگەوتو بڵاوکردنەوەی خوێندەواری‌و پەیوەندی کردن بە ئیمارەتەکانی ترەوە درێغی نەکرد. بەڵام لە ژێر کاریگەری بێگانەو لاوازی کوردان خۆیاندا ئەو هەوڵانەش سەرکەوتوو نەبوون[٣٢] بۆ ئەم سەردەمەش ئەو بابەتە چەق بەستووانە ئەوەندە فشاری پەستانەوەیان لەسەرە، پەنماوون. رێگەی وانەو ئەزموون تێیاندا زۆر کرۆڵە. لە پاڵ ئەم هۆکارەشدا چەندین دیکۆمێنتی تر هەن‌و نهێنین. بەڵام تاوەکو ئێستا وەک

---

٣١- بڕوانە نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد لەبەرداشی رۆم‌و عەجەمدا، چاپخانەی مەڵبەندی ئاوەدان کردنەوەی کوردستان،١٩٩٨.

٣٢- خوێندنەوەی مێژوویی لە کتێبی شەرەفنامەو ئەحمەدی خانی‌و مەلای جزیریەوە تا کتێبەکانی نەوشیروان مستەفا، کورد لەبەرداشی رۆم‌وعەجەم، بەدەم رێگاوە گوڵچنین.. هتد، چەندین راستی ئەو رەوشە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیانە ئاشکرا ئەکەن.

پاڵەرێکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ سەیر ناکرێنو لەو شێوازە قەیرانو نەهامەتیانە خۆیان ڕزگار ناکەن.

بمانەوێت یان نەمانەوێت گەشەی کۆمەڵگە بە چەندین سەردەمو قۆناغدا تێئەپەڕێتو مل بۆ چەندین یاسای گۆڕانکاری ئەدات. وەک یاسای گەشە کردنی خودی مرۆڤ خۆی وایە. هەر بیرمەندو پێوگەیەک گەشەی کۆمەڵگە بە شێوازێک شیتەڵ ئەکات. هەرچۆنێک بێت ئێمەی کورد یەکێکین لە کۆمەڵگەکانی ئەم دنیایەو ئەو یاسایانە ئێمەش ئەگرنەوە. یان لە چەندین لایەنەوە شتەکان وێکچوونو هەندێ ووردە پابەندی پێوە دیارە. ئاماژە کردن بە بوونی دەسەڵاتو سەرکردە شێوازی بونیادی کۆمەڵگە دەرئەخات. بەڵام لە کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی نالیدا بەو شێوازە مانەند کراوە. بۆیە نالی خۆی ئەیەوێت بە ڕەچەڵەکی مێژووی بابەتەکاندا شۆڕبێتەوەو جۆرە پابەندییەک بۆ خەڵکی دروست بکات، کە سەرچاوەکەی وشیاریی کۆمەڵایەتی بێتو بکەونە بیرکردنەوە وەک چۆن فارسو تورکەکان لەو ڕێگەیەوە وشیاری نەتەوەیی خۆیانیان دارشتو لە هەمان کاتیشدا خۆیان پێ سەپاند[٣٣].

ئەو ڕاستیە ئاشکرایە بەهۆی سلێمانو ئەحمەد پاشای کوڕیەوە ویستویەتی برەو بە خەڵکیو قەڵمڕەوی بابان بداتو گەشەی وشیاری تیادا ببوژێنێتەوە. دەست بکرێت بە دامەزراندنی ئەو بنەمایانەی ناوەڕۆکی بیرو ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە گەشاوەتر بکات. نالی لە شیعرە نایابەکانیدا، کە پڕن لە جوانیو چێژ ئەو ڕاستی دادپەروەرو

---

٣٣-بڕوانە ئازاد قەزازمرۆڤو دەسەلات، چاپخانەی پەیوەند، ٢٠٠٨.

شەڕەنگێزو گەندەڵ بەدی ئەکرێت. باوەڕ ناکەم نالی لە خۆیەوە یاخود بۆ چاپلوسی ئەم دێرە شیعرەی وتبێت:

**قیصصە بێ پەردەو کینایەت خۆشە : شاهی من کەوا**

**عادیلێ بوو قەت عەدیلی ئەو لە دنیادا نەبوو ،** (٣٧٣:١٤)

نالی وەک ئێستای ئێمە بە چاکی درکی بەوە کردووە، سەرۆکو سەرکردەی دڵسۆزی راستەقینە لێپرسراوە بەرامبەر نەبوونیو نەهامەتیو گرفتی دوورترین کەس لەم پەڕی وڵات بۆ ئەوپەڕی. سەرکردەی راستەقینە بە هەموو تواناییەکی پێویستە هەوڵی پووکانەوەی نەهامەتیو کارەساتەکان بدات. بە پێچەوانەشەوە ئەوە خۆسەپێنە. مێژووش ناتوانێ ئەگەر بە زۆریش بێت تاکە وشەیەکی شیاوی ئەو سەردەمەی پێڕەوا ببینێ. جا ئەگەر بە لایەنە باشەکەدا هەڵزنێت ئەوە سەردەمی گەشانەوەو پێشکەوتنو گۆڕانکاری مادیو کۆمەڵایەتی بۆ ترۆپکی دڵسۆزیو مێژووی پڕ شانازی تۆمار ئەکات. کۆمەڵگە دەست بە کەمەری یەکترییەوە ئەگرن. ئەو سەردەمەی سەرکردەی راستگۆو دڵسۆزی نەتەوەو وڵات هەوڵی یەکبوون بدات ئەتوانرێت بارە ئاڵۆزەکان چارەسەر بکرێنو دوژمنایەتیو دۆستایەتی دیاری بکرێت. وڵاتو کۆمەڵگە بە چەندین ئاستی بەرەو پێشچووندا بڕوات. هەر ئەم هۆیەش بوو خودی ئەم مەزنەی کورد پەنای بۆ زمانی رەسەنی کوردی بردووەو وەک هەر زمانێکی تری دنیای ئەو سەردەمەو ئەمڕۆش ویستویەتی وڵاتو خۆیی لێوە پێناسە بکاتو ئاڵاو والای بکات. زۆر بە وردەکاریو شارەزایانە چۆتە تەمەنی گەشەی شارستانیەتیەوە، ئەگەر ئێمە بمانەوێت یان نەء بنووسرێتەوە یان نەنووسرێتەوە ئەوە تەمەنی شارستانیەتەکە خۆی دەڕواتو لایەنی دیارو نا دیاری

ئەو سەردەمو کەسایەتیو ماریفەتە ئەهێنێت بۆ سەردەمێکیترو ئاشکرایان ئەکات.

نالی زۆر وشیارانە ئاماژەی بەو لایەنانە کردووەو ئەڵێت:

**بێ قسەی خونچەی دەمت کاتی تەبەسوم رووبەڕوو**

**هەتکی شوعلەی بەرق و نەظمی دائیرەی پەروین دەکات**(١١٢:١٤)

رووداو بەردەوام سەرچاوەکەی تاکەکەسە هیچ روداوێکیش لە سنووری تاکەکەسەو کاریگەری تێڕوانینو دەرکەوتنی نییە ئەگەر نە پەڕنەوە بەرەو دەستەیەکو ببێتە جێگەی سەرنجو کاری خۆییان بکەن. لێرەدا نالی روداوەکەی لەو سنوردارییەوە وەک خونچە گوڵ شوبهاندووەو لە دەمی خونچەییەوە دێتە دەرەوە. ئەگەر وابێت یا نەء ئەوا بە روناکی بیرو ماریفەت شتەکان لە کاتێکی تردا والاو ئاشکرا ئەبن. لە خونچەوە ئەڕوات بۆ بیری دڵو بەرەو تێگەشتنو جەلالی عەقڵ. بە وردەکاریەکی وریایانەوە ئەڵێت:

**تیری موژگانت لە سینەمدا دەچێ بۆ بیری دڵ**

**هێندە کەچ شایینە قەصدی خا نەدانی دین دەکا**

**گوڵ بەدەم بای سەباوە پێکەنی یەعنی وەرە**

**تۆ لە وەصلم بۆ بەرە ، ئەو بۆیە بولبول شین دەکا**(١١٢:١٤-١١٣)

چونکە ئیتر بەرەو ئاشکرا بوونو بیری گۆڕانە سروشتیو کۆمەڵایەتیەکان ئەڕوات بای نوێ ئەدات لە گوڵی پشکوتوی نوێ، گوڵی شارستانیەتی بەسەرچوو بەرەو پیربوونو لەناوچوون ئەباتو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیش بەرەو پووکانەوە ئەبات. ئەکەونە هەڵەکە سەما. چونکە ئەو کردارە بە بەردەوامی لە کایەدایەو ناتوانرێت رێی لێ بگیرێت.

نالی لەو روانگەیەوە ویستی تێگەیاندنی خەڵکە بۆ گۆڕانکاریەکان. هەوڵ ئەدات تواناکانی کۆمەڵ بە شێوازێک بەکاربهێنێتو چی هەیە بۆ ئاشکرا بوون برەوی پێ بدات. بە هۆنراوە ئەو گۆڕانکاریو گەشە کردنانە ئاشکرا بکاتو برەوی زیاتریان پێ بدات. وڵاتی خۆی لە هیچ ئاستێکدا لە ئاستی وڵاتانی تردا بەکەم نەزانێت. هەوڵی دامەزراندنو خستنە سەرپێیداوە، تاوەکو خەڵکی تیادا پێ بگاتو هونەری تیادا بکاتە ئاوێنەی ناسینەوەی وڵاتەکەی خۆی. خەڵکی رووی تێبکات. وانەو سەلیقەی لێوەرگرن. لە یەکێک لە شاکارە بەناوبانگەکانیدا ئەم راستیە ئاماژەی راستەوخۆ پێئەداتو ئەڵێت:

**طەبعی شەککەر باری من ، کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**

**ئیمتحانی خۆیە مەقصودی ، لە (عمدا) وا دەکا**(١٤:١٠٦-١٠)

ئەو (عەمدو عینادیەی) نالی دیارە راستەخۆ مەبەستی برەودانە بە بوونی زمانو ئەدەبو مێژووی کۆمەڵایەتی نەتەوەیەک. تا وەک نامە بیگەینێتە دەوروبەرو خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت.

مێژووی رۆشنبیریو شارستانیو کولتووری هەر کۆمەڵگەیەک لە ئەنجامی زنجیرە پەیوەندیەکی مادیو سیمای هاوبەشی هزری شارستانیەتەوە هاتۆتە کایەوە. ئەو گۆڕانکاریانەی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا روویانداوەو رووئەدەن بوونەتە هۆی چەندین کاردانەوەی نێگەتیڤو تا رادەیەکیش پۆزیتیڤیان تیادا ئەبینرێتەوە. ئەمەیان تەنها لە رووی جیاوازی هزری کۆمەڵایەتیو بیری خەڵکیدا ئەبینرێتەوە. ئەتوانرێت لە بوارێکی ئاشکراو بەرجەستە کراوی رۆژانەدا درکیان پێ بکەین.

له بواری سۆسیۆلۆژیادا گرنگی بەرچاو بە بواری ئەدەبی ئەدرێت، وەک یەکێ لە دیاردەکانی ناو کۆمەڵگە مامەڵەی لەگەڵدا ئەکرێت، ئەدەب بە هەموو تانو پۆکانییەوە بەشێکی گرنگی پێکهاتەی رۆشنبیری، شارستانی، کولتووری کۆمەڵگەیە دوو سەرە لە بوونی ئەو پێکهتانەدا کاریگەرو کارلێکراوە،

لە ساڵەکانی (**١٩٣٠**) ی سەدەی رابردوودا لە سۆسیۆلۆژیادا بیرمەندی بەناوبانگی سۆسیۆلۆژیا **پیترم سورۆکین** لە توێژینەوە بەناوبانگەکەیدا لە سەر (دینامیکیەتی کۆمەڵایەتی- رۆشنبیری) شرۆڤەی ناوەرۆکی چەند کارێکی هونەری مویزیکو ئەدەبو فەلسەفی کردووە. بەو مەبەستەی چەندین واتاو ئاماژەی تایبەتی رۆشنبیری، شارستانی، کولتوور روون بکاتەوە. هونەر وەک پردێکی پانوپۆری پەرینەوە وایە چەندین دەستەو گروپ بە هەستو سۆزو تێروانینی جیاوازەوە لە رێگای وروژاندنی تێروانینو درککردن لە بابەتێکی تایبەتەوە لە خۆی کۆدەکاتەوە. ئەوکات خاوەن هونەرەکە ئەگاتە ئەو باوەڕەی، کە توانیویەتی کاریگەری لەسەر بیرە کۆلێکتیڤ (الشعورالجمعي) بۆ بە خۆدا چوونەوەو تێروانینی سەردەمەکە بگۆڕێت[30]. سۆسیۆلۆژ ئەو کاتانە گرنگی بەم بابەتە ئەدات، کە سەرەداوەکانی دەرکەوتبێت. لەو رێگەو پێگەیەی لە کۆمەڵگەدا دیاری کراوە وابەستەییەکی زۆری بە ئاستی گەشەو پێشکەوتنو گۆڕانکاریو تێروانینی مادیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەوە هەبێت. نالی لە دەرەنجامی ئەو گۆرانکاریانەی لەو تەرزە تێروانینە بەرفراوانەی خۆیەوە توانیویەتی رۆڵی خانمان بگەیەنێتە ناو خەڵک بە هەمان شێوە دەستەو گروپی تایبەت لە خۆی کۆبکاتەوە. توانیویەتی وێنایەکی ماریفیو هەستو سۆزو تەنگەژەو بابەتەکانی وابەستە بە خانمانەوە بخرۆشێنێت. ئەو وێناو مانەندەی لە

شیعری نالیدا هەیە تەنها جوانکردنو بۆچوونی هونەری نییە، بەڵکو پەلکێشی ترۆپکی ئاماژەکانی ڕێزی خانمانمان دەکات. هەستێک لای خوێنەری خۆی دروست ئەکات کە لیوان لێوە لە پیاهەڵدانو تێڕوانینی ڕاستەقینەی هزر، ڕاستە ئەو شێوە مانەندکردنانە ئەکەونە بەهای جوانیەوە، بەڵام باوەڕی کۆمەڵایەتی لە ژێر فشاری ئەو هەستەدا دەراوێکی کۆمەڵایەتیو زانست واڵا ئەکات، تابلۆیەکی ڕۆشنبیری، شارستانی پۆزەتیڤ بە کۆمەڵگە ئەگەیەنێت. بابەتی خانمان لە بیری نالیدا یەکێک بووە لەو سۆنگە گرنگە بابەتیانەی لە زۆر لایەنی کۆمەڵایەتیو پەروەردەییو دەروونیەوە باسی کردوون. هەموو ئەو بابەتانەی نالی باسی کردوون ئاماژەیەکی گرنگی وشیاری بووە بە ڕۆڵی خانمان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، هەوڵی گەورەی گۆڕانکاری تیادا گرتۆتەبەر.

لە شارستانی کۆمەڵگەی کوردیدا خانمان بابەتێکی گرنگنو لە هەمان کاتیشدا بابەتێکی سنووردارن[٣٤] بەوەی، تاوەکو ئێستا بیری خێڵەکیو پیاو سالاریو

---

٣٤- زۆربەی ڕونبیران تێڕوانینی جیاوازیان بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم بابەتە هەیە. بەڵام هەتا ئێستا هەوڵ نەدراوە ئەم لایەنە لە بێژنگی کولتوور بدەنو بواری مرۆڤایەتی تیادا گەشە پێبدەن. لای ئێمە واتای خانمان چەندین واتایترەوە وابەستەیە. زۆر نامۆیە ئەو کاتانەی نەتەوەیەک بەردەوام هەوڵی خۆ بەرەو پێشبردن بداتو باس لە دیموکراتیەتو مافی مرۆڤو ئاشتی کۆمەڵگە بکات، لە پەناوە داکۆکیو پێداگربێت لەسەر نەکرانەوەی بەهای کۆمەڵایەتی. ئەوانەشی تاکو ئێستا لەسەر خانمانو بابەتەکانییان تەنانەت ئەگەر خانمان خۆشیانبن ڕەواڵەتو بابەتیانە شۆڕبوونەوەو چارەسەری بابەتیانەی سەردەمیان تیادا نەبینرێتەوەو لە بواری تیۆری خۆیان دەربازناکەن. چارەسەرەکان تەنها لە گۆشە نیگای لایەندارییەوە مامەڵەئەکرێن. هەر ئەم لایەنەیە، کە داکۆکی لە پێکهاتەی جەستەییو سنوردارکردنی تواناکانی خانمان ئەکات، کە پێوستە لە سەر بناغەو پەیوەندییە بەردەوامەکانی ڕەوشی مێژوییو ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتیەوە چارەسەربکرێن. هەرچی زووە لایەنی پێشکەوتوخوازی جێگە بەو لایەنە شۆڕشگێڕییە لەقبکات، کە تاوەکو ئێستا برەوی هەیە. ئەو بابەتە ئەتوانێت چارەسەری کێشەی ئەو سنوورە سوورە کێشراوانە بکات. بەستنەوەی مێژوو بە لایەنی هزرو خۆشگوزەرانیو پێشکەوتنی بابەتیانەی کۆمەڵگاوە مرۆڤ وابەستە ئەکات بە خودی کۆمەڵگا خۆیەوە، نەک بە لایەنێکی سیاسی دیاریکراوەوە، چوونکە زۆر داموو دەزگاو بەهای ڕەسەنی مرۆڤانەی کۆمەڵگا لاواز ئەکات، تاکو ئەو ڕادەیەی، کە وایلێدێت بەرەو پووکانەوە بچێت. بۆ نمونە کارکردنی خانمان بریتیە لە ئازادی

پەرژیک (محافظ)و باوک سالاری زاڵە بەسەریدا. لە هەمان کاتدا خانمان بەشێکی ئەو کۆمەڵگایەن. ئەو بیرو بۆچوونانە بابەتی زۆر گرنگتر لە خۆیان ئەگرن، کە هەندێ جار خودی خانمان خۆیان ئەکەونە ئەو گێژاوەوە. بەوەی وەک کاڵایەکی کڕین‌و فرۆشتنی چێژ وەرگرتن مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرێت. هەر بۆیە رۆژ بە ڕۆژ کاری خانمان لە وڵاتدا بەردەوام بەرەو کەمبوونەوە ئەچێت‌و تاوەکو بێت لە چوارچێوەی ماڵ‌و چێشتخانە ئەخزێنرێن توندوتیژی بەرامبەریان زیاد ئەبێت‌و شوێن پێیان بچووکتر ئەکاتەوە. بۆ ئەم لایەنە نالی لەو سەردەمەی رادەی پابەندی داب‌و نەریت‌و ئایین‌و ...هتد زۆر لەم سەردەمەی ئێستا سنووردارتر بووە ویستویەتی بەری ئەو سنورە بەرفراوانتر بکات‌و رێچکەیەکی ئازادی خۆماڵی بگرێتە بەر. لە نامەکەیدا، کە بۆ مردنی باوکی حەبیبەی ناردووە ئاماژەیەکی راستەقینەی ئەو دەستەواژەیەی (لاباری فەرەسییە)، کە لەو باوەڕەدایە هونەر یاخی بوونە لە هەموو ئەو کۆت‌و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ لە قاڵب ئەدەن.

نالی بە ئاشکرا ئەنوسێت:

**بەس بگریە بۆ پودەر و بابی حیجابت**

**بێ‌بابییی تۆ مووریثە بۆ وەصل و مولاقات !**(١٤٠:١٤)

لە هەمان کاتدا رۆڵ‌و پێگەیەکی ئەمەندە شیاوی داوەتە خانمان مەگەر هەر خۆی بتوانێت لەو سەردەمەداو بۆ ئێستاش ئەمەندە بەرز بیاننرخێنێت. هەر جارەی بە

---

ئابووری‌و چەندین رووی خۆشگوزەرانی جیاواز، کە ئەبێتە هۆی گەشەی تەواوەتی لە هەموو روویەکی مادی‌و مرۆییەوە، چونکە ئاشکرایە لە هەموو چالاکیەکانی کۆمەڵگادا پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بە پلەی پێشکەوتن‌و پێگەی خانمان پێوانە ئەکرێت. لەبەر ئەوەی وەک مرۆڤ هاوبەش‌و تەواوکاری کۆمەڵگایەو ئازادی‌و سەرکەوتنی پابەندە بە رزگاربوونی کۆمەڵگا خۆیەوە.

ناوێک لە شاکارێکدا بانگیان دەکاتو بەرزترینو جوانترینو مرۆڤانەترین پێگەی پێ بەخشیوون لە شاکارێکیدا ئەڵێت:

**ئیشارەم کردە ئەبرۆی ، یەعنی : میحرابت کەچە ، فەرمووی :**

**ئەمە قیبلەی تەمامی عالەمە ، جێی جیلوەی ئیمامە**

**لە سایەی ڕووی تۆوە شامی خەڵقی طەلعەتی صوبحە**

**لە شامی زولفی تۆوە صوبحی ئێمە ظوڵمەتی شامە**(١٤:٤٧١-٤٧٢)

یاخود لە شاکارێکیتردا بەم شێوەیە پێگەی خانمان دیاری ئەکاتو ئەڵێت:

**لە سەر بەرگی گوڵێکی باغی حوسنت**

**هەزار ، گوڵچینی بێ بەرگ و نەواچین !**

**ئەتۆ میهرییو مەهرووییان ستارەن**

**لە خزمەت شەوقی تۆدا شەوچرا چین ؟**(١٤:٣٤٧-٣٤٨)

ئەم هۆنراوەیەو تەواوی ئەو هۆنراوانەی بۆ ئەوینو خۆشەویستی نووسیوونی دیاردەیەکی ڕۆشنبیری کۆمەلایەتی بەرزی تیادا ڕەچاو دەکرێت. لە هەر هەموویاندا وەک مرۆڤ، وەک دایک، وەک خوشک، وەک خۆشەویست، وەک ئاییندار، وەک خۆشەویسترینو بەرزترین مرۆڤ نرخاندوونی. تاوەکو ئەو ڕادەیەی گەیاندوونی بەو باوەڕەی هیچ مرۆڤێک لە دنیادا لە ئاستی ئەو بوونەوەرە خۆشەویستەدا ناتوانێت بەرز خۆی ڕابگرێتو پێویستە شۆڕەندی یەکێک لە خۆشەویستییەکانی بێتو چۆکی بۆ دا بدات. ئەڵێت:

**بە سەروم وت کە ڕاستە سەرکەش و بەرزی ، کەچی لەرزی :**

**کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان بەندەی قەدی یارم !**(١٤:٢٧٣)

یاخود ئەو کاتانەی ئەیەوێت خۆشەویستی خۆیی بۆ بسەلمێنێت

**خاکی بەری پێت هەم گل و هەم گوڵ بە سووروشکم**

**وەقتی غەم و شادی ئەوە کردووەمە بەسەردا**(٧٩:١٤)

ئاژەڵ یەک هەستی هەیە ژیانی ناوەو دەرەوەی وەک یەکە. لای مرۆڤ ژیانی دەرەوەو ناوەوە جیاوازن، ژیانی ناوەوەی بریتیە لە کرۆکی پەیوەندیەکانی بە ژینگەی مرۆڤایەتی خۆیو چۆنیەتی شرۆڤەکردنیەوە. بەوەی تاوەکو چ رادەیەک توانیویەتی ئەو پەیوەندییانە بە بیرو زمانیەوە ببەستێتەوە. هەر لایەنێک لەو بارەیەوە بگریت هەر مرۆڤ خۆیەتی. هەندێک جار خۆی بە تەنیاو هەندێک جار بابەتو هەندێک جاریش هەردووکیان پێکەوە بەرەو روومان ئەبنەوە. جیاوازی نێوان ئاژەڵو مرۆڤ هەر لە زمانو ئاییندا نییە، ئایین هۆشێکی خودییەو سنووری هەیە، بەڵام ناوەڕۆکی وشیاریی مرۆڤ بێ سنوورە(١٥٢:٢٧)، چونکە بارگەی بوونی بێ سنووری خستووە. لە هەناوی خۆیەوە هەست بە گەورەیی خۆی ئەکات. لەبەردەم ئەو گەورەییەدا بچووک دەنوێنێت. کەچی ئەوەندەی‌تر خۆی گەورە ئەکات. ئەگەر درک بە راستی کرۆکی بابەتەکە بکرێت. هەڵبەت ئەو مەزنە مرۆڤەی کورد لە خۆیەوە نالێت:

**سەیلی هیجرت بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامە دەر**

**باری بیرت قەددی راستی تێکشاندم وەک فەنەر**(٢٠١:١٤)

شیعرەکانی نالی لە روانگەیەکی بابەتییانەو بیرێکی پێگەیشتوەوە کەوتوونەتە بەردیدی خەڵکی. تویژینەوە لە هەر تێڕوانێکی کۆمەڵایەتی بە کرۆکەوە بکرێت بە هەر واتایەک بێت ئەگەر لە سۆنگەو بیری پیاو سالاری داماڵرێنو بەرگی

مرۆڤانەیان بە بەردا بکرێت، ئەوە شرۆڤەی راستەقینەی رەوتی گەشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیان لێوە بەرجەستە ئەبێت. هەر ئەم داماڵینەیە، کە مرۆڤ بەرەوڕووی دەروونو هەستو سۆزو چێژی ژیانێکی پڕ خۆشەوسیتی ئەکاتەوە. بەرزنرخاندنو رێزو خۆشەویستیو گرنگیدانی پێگەی کۆمەڵایەتی بۆ خانمان لەوە بەرزتر ئەنرخێنرێت؟ کە هەموو ئەو تێڕوانینانەی نالی لە ترۆپکی وشیاری خودی خۆیەوە هێناونیەتە بەر.

مرۆڤ پێویستی بەوە نییە خەڵکی هەست بە وشیاریەکەی بکەن. بەڵکو هەست کردن بە وشیاری مرۆڤ هەست کردنە بە وشیاری خود. لە وشیاری هەڵبژاردنی دولبەرەکەی خۆیەوە هەستی وشیاری ئەویشی لە چاویدا بەدی کردووە. ئەمە لە هۆنراوەیەکی نالیدا ئاشکرایەو ئەڵێت:

**بنازم دولبەری خۆم چەندە پڕ وەصف و چ بێ عەیبە.**

**بە چاو مەستو بە دڵ هوشیار ، بە ئەبرۆ جوتو هەم تاقە**(٤٥٦:١٤)

مرۆڤ بێ بوونی بابەت لە ژیانی مادیو کۆمەڵایەتیدا شوێنی نابێتەوە. ئەم هاوکێشەیە چۆنیەتی ژیانی کۆمەڵایەتی لای نالی دیاری کردووە. نالی نێوەڕۆکی خودی خۆیی بە پەوەندیەکی پتەوی نێوان پێویستیە بابەیتیەکانەوە لکاندبوو. کرۆکی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیەی لە وشیارییەکی سۆسیۆلۆژییانەوە لەگەڵ سروشتی بووندا ئاوێتە کردبوو. ئەوەتا زۆر بە وردی لە نێو ئەو کرۆکەوە ئەڵێت:

**هەر چەندە کە ئینسانە لەبەر چاوی من و تۆ ،**

**ممکین نییە ئەم لوطفە لە ئینسان و بەشەردا**(٨١:١٤)

ئەم بابەتە لە خۆشەویستیەکی بابەتی راستەقینەدا نەبێت دەرناکەوێت. بابەتی بوون لای نالی، کە دروشمەکەی سوکراتی هەڵگرتووە (خۆت خۆت بناسە) ئێستا بۆتە ئەسنۆلۆژیا. لەم روانگەیەوەیە نالی ناوەڕۆکی مرۆڤی لە مرۆڤایەتیدا ئاماژە پێداوە. واتە کرۆکی مرۆڤ لە کۆمەڵایەتی بوونی خودی مرۆڤەکەدایەو سێ واتای پێداوە: هزرو خواستو دڵ. **هزر** وەک ئەو ئامرازەی، کە ئەبێتە هۆکاری بەرهەم هێنانی ئەو بیرکردنەوانەی مرۆڤ بە ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتییەوە وابەستە ئەکاتو کرداری بیرکردنەوە ئەجوڵێنێت. **خواست** سێ بەشە، کە بریتیە لە هەوڵو کارو رەوشت. **دڵی** داناوە بە خۆشەویستی. هەمان ئەو ئاماژەیەیە، کە ئەفلاتون بێ جیاوازی لە نێوان دەروونو جەستە یان خەیاڵو راستی باسی لێوە کردوون. جگە لەوە (زانستو خواستو خۆشەویستی) سێ جۆری جوانکارین، یاخود سێ لایەنن ناوەڕۆکی راستەقینەی مرۆڤ دەرئەخەنو مرۆڤ ئەکتیڤ ئەکەن. مەبەستی **زانست** زانستە. خۆشەویستیش خۆشەویستیە[(١٩٢:٨)]. هەر ئەمانەشی بۆ مانەندی سروشتی خود بەکارهێناوە. لە شاکارێکی بێ وێنەدا گەورەیی ئەو سێ لایەنە بۆ ئێمە ئاشکرا ئەکاتو ئەڵێت:

**بێش و کەم بێ شکەم و حیرص ، وەکو طیفلی رەضیع**

**زاوییە بێشکەم و ، بێ شکم و بێ حییەلم**[(٢٩١:١٤)]

ئەمانە تاکە رستیەک نین، کە نالی ئاماژەی پێداوون، تاوەکو مرۆڤ چێژی لێ ببینرێت، ئەوانە توانایەکی ئەوتۆن، کە ناتوانرێت بە هیچ شێوەیەک بەرهەڵستیش بکرێن. تەنها زانست بە زانستو ئیرادە بە خواستو خۆشەویستی بە خۆشەویستی نەبێت.

خۆشەویستی پاڵ بە مرۆڤەوە ئەنێت بۆ مردن لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا. نالی ئەمەندە لە کۆمەڵایەتی بوونی خۆشەویستیدا شۆڕبۆتەوە کەوتۆتە رەوشێکی مەترسیداری گەورەوە، کە نەکا بمرێتو ئومێدی خۆشەویستەکەی سەرەو نگوم ببێت. خۆی بە ئاشکرا لە دەردی دووری خۆشەویستەکەیەوە ئەڵێت:

**عەزیزم ! دڵ ڕەقە و ، خۆم فەرد و تەنهام**

**ئەترسم بمکوژێ ئەم دەردە بێ تۆ**

**بە بێ دیداری تۆ خۆ لاڵە ((نالی))**

**عەجەب هەستاوە ئەم چەن فەردە بێ تۆ !** (٣٨٠:١٤)

خۆشەویستی راستەقینە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ بیرکردنەوەیەک، کە گەورەیی‌و دڵسۆزی خۆت لە ئاستی کەسدا نەبینیتەوەو تەنها بە خۆشەویستەکەتی رەوابیبینی‌و ئەویش لە خۆت بەرزتر رابگری. لە شاکارێکی بێ وێنەدا بۆ ئەم لایەنە ئەڵێت:

**دوور لە تۆ ((نالی)) سەگێکە ، بێوەفایە ، هەرزە گۆ**

**بۆچی بانگی ناکەی ئەم کەلبە کە نانی نانییە**(٥٩١:١٤)

ئەو پێ لێنانە ئازاراوی‌و ژانی خۆشەویستیەی، کە نالی بۆ ئێمەی درکاندووە بوونەتە ئاماژەیەکی ئاشکرای مەزن بوونی مرۆڤانە. ئەگینا کەس هەیە ئەگەر دڵو جەستەو بیرو ژیانی لە خۆشەویستیەکی راستەقینەدا دانەپۆشرابێت ئەو وشانە بە ئاستی گەورەیی خۆی بەراورد بکات؟ خۆ هەر هەمان نالی‌یە، کە خۆی زۆر لە بەناوبەنگەکانی ئەو سەردەمەی وەک مەولانا جەلالەدینی رۆمی‌و سیفەدینی ئاموودی بە باشترو شایستەتر ئەزانێتو ئەڵێت:

((نالیا)) ئەم غەزەلەت تازە بە تازە وتووە

بە دوصەد (مەثنەوی) یو (لوبیی لوباب)ی نادەم[(٣٠٨:١٤)]

نالی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانی ژیانی مرۆڤی وەک جوڵانەوەیەکی میکانیکی داناوەو لەگەڵ یاساکانی سروشتدا بەراوردی کردوون. زمانی کردۆتە کیلیلی بیرو هەرچی جوانکاریی‌و وشەسازی هەیە هێناونییەتە کایەوە. کردوونیەتە وانەی ئەزموونە کۆمەڵایەتیەکان. توانیویەتی مانەندێکی وردی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان بکات‌و لە ئەزموونێکی زیندوودا ئەو چالاکیە جۆراوجۆرانەی گەیاندۆتە ترۆپکی ئاشکرا کردن. بەو جۆرەی هەست‌و سۆزمان تێکەڵی ئەو چالاکیە راستەقینانە ئەکات، تاوەکو بتوانین ئەزموونی نوێیان لێ دەرهێنجین، ئەمانە هێزێکی کۆمەڵایەتین‌و لە بەرهەمەکانی نالی‌دا بوونیان هەیە. ئەو ئەزموونانەن، کە بەردەوام کاریگەرییان هەیەو دەستگیری بەرفرەوانی زانستی کۆمەڵایەتی سەردەمەکە ئەکەن. خۆی واتەنی:

لایقی مەخزەنی طەبعە هەموو کەنزی غەزەلم

قابیلی ضەربی ڕەواجە زەڕ و زیوی مەثەلم [(٢٨٨:١٤)]

نالی هەستە کۆمەڵایەتیەکانی بە پێداویستیەکانی ژیانی مرۆڤەوە بەستوونەتەوە بەو مەرجەی هزر بەرێیانەوە بەرێت. لەم روانگە فەلسەفیەوە لە لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی روانیووەو شێوازی بیرکردنەوەشی داوەتە دەست هزرو لەوێوە نەخشەی کۆمەڵایەتی بۆ دارشتوون.

هزر لای نالی بووە بە پێشرەوی هەست‌و کرۆکی سۆنگە کۆمەڵایەتیەکانی پێ دیاری کردووە، تاکو هزر بتوانێت رەخنەی بونیادنەرانەی بۆ بەجەستە بەڕێ بکات،

چونکە بەرهەمەکانی نالی لە سەر دوو بنەمای سەرەکی وەستاون: خودیو بابەتی. بنەما خودیەکان بریتین لە بواری چێژی وشەئارایی‌و زانستو رۆشنبیری‌و ئەروا. بنەما بابەتییەکان بریتین لە سروشتی هەستی مادی، کە ناواخنی ئەم هەستە بە بەها کۆمەڵایەتییەکان ئاخنراوە(١٢٦:١٩) شاکارەکانی نالی لەم دوو بنەمایە خاڵی نییە. بە وریایانە خۆی پێکیەوە ئاڵاندوون‌و دەراوی رەوشتو ئایین‌و بیرکردنەوەی هزرمەندانەی پێ والا کردوون. لەم بەیتەدا، کە ئەڵێت:

**لۆمەیی ((نالی)) یی دێوانە مەکەن ئەی عوقەلا !**

**ئەمە موددێکە زەدەی لەطمەیی دەست پەرییە** (٥٨٧:١٤)

ئەو شێوە بیرکردنەوانەی، کە کردوونیەتە هۆکاری هێنانەکایەی چەندین زاراوەی فەلسەفی‌و کۆمەڵایەتی. پێگەیەکی ئەدەبی‌و فەلسەفی‌و ماریفەتێکی گونجاوی لە بونیادی کۆمەڵگەو رۆشنبیریدا پێ دارشتوون. وەک ئەو پێگەیەی ئەمڕۆ لە خاکی کوردستاندا بە پێگەی کلاسیکی ناسراوە. نالی سەرقافڵەو پێشڕەوی دامەزراندنێتی. هەر کاتێک بمانەوێت لە بابەتێکی ئاوا بدوێین‌و بە سەردەمی گەشە کردنەکەیدا هەڵزنێین، ئەوە دوو راستی سەرەکی خۆی لە بەردەمماندا قوت ئەکاتەوە:

**یەکەمیان** تایبەتمەندییە. ئەم تایبەتمەندێتیە متمانە دەکاتە سەر شێوازی ئەو رەوشە هزرییەی لە دەوروبەرەکەوە گەشەی کردووە.

**دوەمیان** لەو بواری گەشەو پێشکەوتنەدا، کە زۆر جار چەندین تان‌و پۆی وای لێ دەبێتەوە پەلکێشی چەندین سۆنگەو لایەنی بۆچوونی جۆراوجۆرمان ئەکات. بۆیە توێژینەوەش لەم مەزنە مرۆڤەی کورد بەرەوڕووی چەندین تایبەتمەندی‌و سۆنگەی بیری جیامان ئەکاتەوە. هەموو ئەو بابەتانەشی لە سەری ئەکۆڵینەوە لای نالی

جێگەی خۆیی هەیەو یارمەتی بەرفرەوانی هزری کۆمەڵایەتیمان ئەدات بۆ گەشەی بنەما بابەتیەکان، تاوەکو لە روانگەیەکی دیارو ئاشکراو پێشکەوتوو ترەوە لێی بڕوانرێت.

لێکۆڵینەوە لەم راونەگەیەوە لە بەرهەمەکانی نالی هەندێک بابەت ئاشکرا ئەکات، کە لە بری تەریببوونی لایەنە خودیو بابەتییەکان بابەتەکان پابەندو ئاوێتەی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەبن. نالی وەستایانە ئاوێتەی یەکتری کردوون. هەموو بابەتە نەگۆڕەکانیشی کردۆتە بنەمای ماریفەت. وەک سۆسیۆلۆژێکی بە توانا هاتووە جیاوازیەکانی ئاسمانو ڕیسمانی ئاشکرا کردووە. بە ئاشکرا کردنی چالاکیەکانی مرۆڤ لەسەر زەوی، کە لە هەوڵدانی راستەقینەی باوەڕ بە خۆ بوونەوە پێناسەی کردوون. نالی توانیویەتی زۆر بە دیقەت جەستەو دەروون پێکەوە بلکێنێتو جموجۆڵێکی کۆمەڵایەتیانەی بداتێ. لە شاکارێکی نایابیدا ئەڵێت:

**خاڵی بەینی چاو و ئەبرۆت ئینتیخابی کاتیبە**

**یەعنی نوقطەی فەرقی ئیبنو موقلە وێبنو حاجیبە**

**عەیبو لەعبی خەڵقی کرد تا یاری خستە داوی خۆی**

**خەصمەکەی من کەلبی ئاهو گیرە ، خیرسی لاعیبە**

**لەشکری خەططی شکستە و ، تیپی زولفی تار و مار**

**پادشاهی حوسنی عالەم گیری هێشتا غالیبە** (١٤: ٣٩٨-٣٩٩)

ئەمەیان خودی نالی خۆیەتی، چونکە هەوڵ ئەدات لە سەر ئەزموونەکانی ژیانی راستەقینە چێژ وەرگرێت. لای ئەم مەزنە ئەزموونەکانی ژیانی ئاسایی هەنگاوی یەکەمە بۆ والا بوونی هزرو ئەیانکاتە هەوێنی شرۆڤەی بوونو بیرکردنەوەی لێ

بەرهەم ئەهێنێت، چونکە هەندێک خەسڵەت هەن، بۆ نموونە: کێش، ماوە، بوون. ئەمانە بابەتی راستەقینەن‌و لە ئەزموونی ژیانی مرۆڤدا ئەبنە هەوێن بۆ ئاشکرا کردنی خەسڵەتەکانی تری وەک رۆح‌و رەنگ لە ژیاندا.(٤: ١٥٥-١٦٠) ئەمانە ماریفەتن‌و لەم شاکارەدا وەک نموونە ئەتوانین هەست بەم لایەنە بکەین.

**یەک ڕەنگم و بێ ڕەنگم و ڕەنگین بە هەموو ڕەنگ**

**بەم ڕەنگە دەبێ ڕەنگ ڕژیی عیشقی حەقیقی**(٦٥٥:١٤)

هاتووە حاڵەتە راستەقینەکانی بە رەنگ‌و رۆح تەریب کردووە. لە هەمان کاتیشدا ئاوێتەی یەکتری کردوونەتەوە. ئێمە، تاوەکو ئێستا بنەمایەکی باشترمان نییە بۆ دانانی کێش‌و رەنگ بەو پێودانگەی نالی کردوویەتی. لە خوێندنەوەی هزری نالی‌یەوە، کە سنووری رۆشنبیری بە هزر پێوانە کردووەو راستیەکانی لەو روانگەیەوە داهێناوە. بەو شێوە بیرکردنەوەیە نالی توانیویەتی ئەو سەردەمە بۆ ئێستای ئێمە نوێ بکاتەوە. ئەتوانرێت درک بەو داهێنانەی بکەین. وەک ئاشکرا کردنی شێوازی ئەو بیرکردنەوەی سۆسیۆلۆژیانەی لە دارشتنی شرۆڤەی دیاردەکانی ئایین‌و باوەردا کردوونی، کە ئەیەوێت مرۆڤ خۆی تۆفانی ئاگری باوەڕی خۆی بکوژێنێتەوە.

نالی ژیرانە لەگەڵ زانستە بنچینەییەکانی ئەو سەردەمەدا مامەڵەی کردووەو ئەو زانستانەشی بە ئەرکی کۆمەڵایەتی قورئانەوە بەستۆتەوە. هەتا ئەم رۆژگارە کەسایەتی ئایینی لەو روانگەیە باوەڕ بە زانست دێنێت، کە ئەو زانستە لە سنووری ئایین‌و کتێبە پیرۆزەکاندا ئاماژەیان هەبێت. نەک وەک ئەم بۆچوونەی نالی لەم روانگەیەوە مەبەستێتی خۆی لە دوو تەنوور رزگار بکات:

**جۆشش و تابە لە نێو دیدەیی گریانمدا**

**چ تەنورێکە لە تەندوورەیی طوفانمدا** (٨٩:١٤)

لە پاڵ ئەو باوەڕەدا خەڵکی بە هەموو شتێک زانیووە لە یەک کاتدا فاکتەرو لە هەمان کاتیشدا وەک دەرەنجام، کە توانیویەتی زۆر چمکی گۆڕانکاری لە خودی مرۆڤدا دەست نیشان بکات لە باسکردنەوە بیانپەڕێنێتەوە بۆکارو هەوڵی شرۆڤە کردنی بۆچوون‌و کردەوەشی تیادا بدۆزێتەوە. گۆڕانکاریەکانی سروشتی کردووەتە هۆی گۆڕانکاریی بابەتەکانی‌تری ژیانی مادی‌و بە بواری کۆمەڵایەتیەوەی لکاندوە. شتی چەسپاوی نەهێشتۆتەوە، تەنانەت خودی مرۆڤ خۆشی. ئەمە ئەو لایەنەیە، کە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە زۆر بە ئاشکرا باسی لێوە کراوە، بەوەی تەنها شتێک، کە وەک خۆی بمێنێتەوە، باوەڕە. بابەتی سەرەکیی (بوون)یش هەر لە باوەڕدا ئەبینرێتەوە. ئەو پێکهاتانەشی ئەیان بینین بە هۆی باوەڕەوە چڕ دەبنەوەو دەبنە پاڵپشت بۆ خودی باوەڕ خۆی. باوەڕ یەکەمین بابەتی سەرەکیە، کە بەرامبەر بابەتە جۆراوجۆرە هەست پێکراوەکان دەرئەکەوێت.(٣٢٥:١٢) نالی باوەڕی لە وردەکاریەکی یەکجار پڕ ماناوە شوبهاندووە، کە ئەڵێت:

**طوطییی تۆ لە حیرصی دڵ داوی طەمەع دەکاتە مل**

**بولبولی من لە عەشقی گوڵ تەغنیەوو طەرەب دەکا**(١٠٠:١٤)

ئاستی باوەڕی کەسێتی کۆمەڵایەتی لای نالی لە تەنیای خود زیاتر بەرزبۆتەوە. ئەمەش ئەنجامی سەرنجی ئەو مەزنەیە لە وردبوونەوەی دیاردەو سیمای ئەو وێنەو بابەتانەی، کە لە بارێکی نەزۆکو سەرەتای قەتماغە بەستنەوە هەنگاوی ناوە

بۆ جووڵاندنو گەیاندوونی بە ئاستێکی وا وەک باخی پڕ بۆنو بەرامەو زیندوێتی پڕ بەها بە ئێمەی ناساندووە.

شیعر لای نالی رۆشنبیریەکی زیندووە بۆ مەرامی دڵسۆزیو خەمخۆریو ئاشتیو وریاکردنەوە بە دەماغدا دەدات، ناجۆریو گرێی دەروونیو کۆمەڵایەتی تیادا هەست پێ ناکرێت. بۆیە جۆرە پابەند بوونێک لای ئەم مەزنە بەدی ئەکرێت، کە ئەتوانرێت ئەو پابەندبوونە لە ئاستی دەربڕیندا، یان لە هەموار کردنی هەر جموجۆڵێکی خۆییو نووسینو ترپەی دڵی شاعیرانەیدا بە ئاوازێکی کۆمەڵایەتی رەسەن گوێ بیستی بینو گۆرانی ژیانی لەگەڵدا بڵێینەوە. ئەو ئاستە کۆمەڵایەتیە گەورەو بەرچاوەی لە شیعری نالیدا ئەبینرێت ئەو وزە گەورەیەیە، کە بە گۆڕانکاریەکانی مرۆڤو کۆمەڵگەی کوردی پێوەندگی کردوون، بۆ بە خۆدا چوونەوەو لە واتای راستی گەیشتنو شێوازی فێرکردنی نوێ نەک بە واتای سنوردار کردنی. بەپێی ئەو شاکارانەی، کە بۆ ئێمەی کردووە بە بنەمایەکی گرنگی رۆشنبیری نەتەوەیی ئەوە خۆی مرۆڤێکی بەکارو کردەوە بووە. ئەگینا چۆن بەو شێوە ئاشکرایە هاواری تازەگەری ئەکەنو داوای شکاندنی ماتەم ئەکەن. باوەش بە نوێبوونەوەدا ئەکەن:

**ساقی ! بە مەیی کۆنە لە سەر عادەتی نەو بە**

**بشکێنە بە یەک نەوبە دوصەد ماتەمی تەوبە.** (٣٩١:١٤)

خوێنەرو بیستەر لە شیعرەکانی نالیدا لەو سەردەمەوە، تاوەکو ئێستا، کە ئەیانکاتە خاوەن هۆشێکی کۆمەڵایەتی لە چەندین بواری بیرو بۆچوونی دیاری کراودا لێوان لێوی ماریفەتو راستگۆییان ئەکات. ئەبنە خاوەن ماریفەتێک، کە توانای چارەسەری

چەندین گۆشە نیگای گێچەڵ سازکردنی هەبێت. ئەو شاکارانە وا لە مرۆڤ ئەکەن، کە بەرەو بیرکردنەوەیەکی‌تری کارای ژیان هەنگاو بنێیت. بە هەمان شێواز وەک خودی ئەو مەزنە پێناسە بکرێت. چونکە هەستی راستگۆییو دڵسۆزیو دادپەروەری کۆمەڵایەتی لە مرۆڤدا زیاد ئەکەن. هەست بەو تەکنیکە هونەریە شیاوە ئەکەین، کە ژیانی رۆژانەی پێبەڕێوە ئەچێت. هەست بە ناخو دەروونو رەواڵەتی لێپرسراوان ئەکەین. بە هەمان ئازایەتیەکەی نالی‌یەوە ئەتوانرێت بەرەوڕوویان بووەستین. سڵ لە ناجۆریەکان نەکەینەوە. لە هەمان کاتیشدا هەست بە تەکنیکێکی سۆسیۆلۆژییانە ئەکەین، کە ئەم جۆرەیان پاڵنەرێکی راستەوخۆیە بەرەو راست کردنەوەی هەقیقەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و هەوڵی گۆرانکاری شایستە. خوێندنەوەی هەڵویستە جوانەکان. لایەنە نا دروستو ناجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیان بە ئاشکرا تێدا بەلاوە ئەنرێت. ئەمە خۆی لە خۆیدا هۆش بە بەردا هاتنەوەیە. لەوە بە دواوە خۆشەویستی بۆ دەستەواژەکان زیاد ئەبنو گەڕان بە دەریای بیرکردنەوەی هزریی نالی‌دا دەست پێ ئەکرێت. ئەم هەستە دێوەزمەکانی چەقین بەلاوە ئەنێتو هەوڵی راستەوخۆی گۆڕانکاری ئەدات.

نالی بۆ لەبار بردنی چەق بەستن تەکنیکی ئالاو والای گەشەو پێشکەوتنی بیرکردنەوەیی لە هۆشەوە بەکارهێناوە. چونکە ئەو مەزنە لە هەموو دێڕە شیعرێکدا دیپەکی کردۆتە سەر رەواڵەتو لە ناوەڕۆک دوور نەکەوتۆتەوە. هەردووکیانی بە واتای دیاری کراوەوە بەستۆتەوە. لە نەبوونی رەواڵەت لە ناوەڕۆکدا دیدێکی‌تری خستۆتە سەر رەواڵەتەکە بەو شێوازەی لە ناوەڕۆک دانەبڕێت. نموونەی ئەم لایەنە لە شاکارێکی بە بەهادا ئاشکرایە کە لە رەواڵەتێکی ئاسایی پڕ ماناوە رۆچۆتە ناو

کرۆکی خۆشەویستییەوەو بەهەردووکیان مانایەکی مرۆڤانەی بە بەهای تیادا چڕ کردوونەتەوە. ئەڵێت:

**بۆ تۆزی رەهت دیدە سەقاوو موژە جاڕووب**

**ترسام کە لە پێت چێت دەمی جێت بماڵم** (٢٨٧:١٤)

هەموو ئەو بابەتە رەواڵەتیانەی لە کرۆکی چەند بابەتێکی ژیانی کۆمەڵایەتیو خۆشەویستی مرۆڤانەی راستەقینەی پڕ واتا دەرخستووە.

خۆشەویستی نالی بۆ نیشتمانەکەی لە هەمان سۆنگەی سۆسیۆلۆژییەوە ئاشکرایە. بەڵام وەک دیاردە زیاتر لە دوای سەردەمی بەجێهێشتنی نالیەوە دەرکەوت بە هۆی ئەو گۆڕانکاریانەی، کە بە سەر رەوشی ناوچەکەو سەردەمەکەدا هاتن.

داهێنانەکانی نالی لەم بوارە مرۆڤایەتیو وڵات پەرستیەوە ئاشکرایە، کە بنەمایەکی مێژوویيو پێویستی بۆ نەتەوەکەمان دارشتو باکورو باشورو رۆژهەڵاتو رۆژئاوای کردە خاوەنی زمانی خۆیان.

ئەو کاتەی هەموو مەرجە خۆییو کۆمەڵایەتیە بابەتیەکان لە تواناکانی ئەو مەزنەدا ئاشکرا ئەبن، هەوڵی تێگەشتنو دەربڕینی ئەدرێت، بەش بە حالی خۆی رەوتی کاری داهێنارانەی لە دوایەو لە سنوورێکی دیاری کراودا ناوەستێتەوە. نالی بە کردەوە کردونیەتە بنەما بۆ سەرتاسەری وڵات، نەک تەنها لە شیعردا، بەڵکو لە تەواوی ئەو زانیاریە مرۆڤایەتیانەی دەسەڵاتی بە سەردا هەبووەو بە دەستی هێناوە.لە کۆتاییدا هەر ئەوە ماوە دووبارەی کەمەوە، کە خۆی ئەڵێت:

**"یا توربەتێ ، یا غوربەتێ یا رێ بشکێنین**

**هەر مونتەظیرە ((نالی)) ئەگەر مرد و ئەگەر ما.** (١٢١:١٤)

## سەرەنجام

ئەم لێکۆڵینەوەیە تێڕوانینو ئاماژەیەکە بۆ ئاشکرا بوونی چەمکێک لە ناوەڕۆکی ئەو کەنووە گەورە پڕ ماریفەتەی ئەمڕۆ لای ئێمە بە **نالی** ناسراوە. ئەم داهێنەرە هەوڵیداوە ژیانی سروشتیو کۆمەڵایەتی لە چەند بوارێکی زیندوودا بە بەرهەمی شیعری، وەک ئەوەی، تاوەکو ئێستا لەبەردەستی ئێمەدایە، ڕێک بخات.

لەم تێڕوانینەوە هەوڵمداوە بە کورتی لە کەسایەتیو داهێنانو ڕۆشنبیریو بواری زمانەوانیو ڕوانگەیەکی کۆمەڵناسییەوە بە کورتی لە بەرهەمەکانی نالی بدوێمو لەو تێڕوانیەوە گەشتوومەتە ئەم دەرەنجامانە:

بە پێی ئەو بۆچوونانەی لە لێکۆڵینەوەکەدا باسکراوون دەرئەکەوێت، کە بیرو هەستی نالی بنەمای گونجاوی پێگەیاندنی کەسایەتی تێدا بەرجەستە بووەو لە گونجاندنی ڕەفتاری خۆییو بەرهەمەکانیدا بە کاریهێناون. لەگەڵ گەشەی تەمەنو جەستەو هزریدا بە بەردەوام پێشی خستوون. تاوەکو بوونەتە مایەی بەرجەستە بوونی ئەو کەسایەتیەی، کە ئەمڕۆ بتوانرێت توێژینەوەو تێڕوانینو بەدواچوونی وردی لە سەر بکرێت.

لە شرۆڤەی بەرهەمەکانی نالیەوە بۆمان ئاشکرا ئەبێت، کە خەسڵەتەکان کەسایەتی، وەک کردارێکی سایکۆلۆجیو فیزیکی بووبوون بە ئاماژەی وزەیەکی دەروونی؛ بە توانایەکی پتەوەوە گواستوونیەتیەوە بۆ دەرەوەی خودی خۆییو کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی بۆ خودی خۆی پێیگەیاندووە.

نالی توانیویەتی ئەو بوارانە ئاشکرا بکات، کە لە ژیانی ئاسایدا بوونی هەیەو کەمتر درکیان پێ ئەکرێت. ئەو درککردنەی کردۆتە بنەمای فەرهەنگی کەسایەتی خۆییو

چەندین پەیوەندیی چالاکی لە سەر کەڵەکە کردوون. بە بەرهەمی زیندوو هەستو نەستی دەروونی خوێنەری خۆیی خستووەتە جموجۆڵ. لە بەرهەمەکانیەوە گەورەیی تواناو ترۆپکی کەسایەتیەکەی ئاشکرا ئەبن.

کەسایەتی نالی لە باسەکەدا بە دوو پێکهاتەی سەرەکی: مادیو کۆمەڵایەتی، یاخود ستوونیو ئاسۆیی خەملێنراوە. لە هەموو لایەنێکی بۆچوونو فێرکردنو ماریفەتەوە هەڵ سەنگێنراون لەو ئاستەوەی، کە خودی خۆی بە دەستەواژەو هەڵسوکەوتی شایستە دیاری کردوون، واتە لە لایەنی مادیو کۆمەڵایەتیەوە، لایەنی سێیەمی بەرجەستە کردووە، کە بریتیە لە توانای دروستکردنی پەیوەندیەکی هاوسەنگو بەردەوام، کە بوونەتە فاکتەری گواستنەوەی چۆنیەتی ئەو دوو پێکهاتەیە لە کەسایەتی نالیدا.

بە پێی شرۆڤەی بەرهەمەکانی وێکچوونێکی سایکۆلۆژیو سۆسیۆلۆژی لە کەسایەتی نالیدا دەرئەکەون. هەرچەندە ئێمە گەنجینەیەکی پێویستمان لە ژیانی مێژوویيو کەسایەتی نالی لەبەردەستدا نییە، جگە لەو بەرهەمانەی، تاوەکو ئەمڕۆ لەبەردەستماندان. بۆیە بە پێی بەرهەمەکانی ئەتوانرێت کەسایەتی نالی چەند خاڵێکی تیادا دەستنیشان بکرێت، لەوانە لە بواری درککردنی بیری ریالیزمدا زۆر چالاک بووەو هەڵوێستی ئاشکراو روونی لە  سەر دەربڕیووە. لە هەر روویەکی پێویستیو پاڵنەرو هەستو سۆزەوە **ئەرستۆ** ئاسا خۆی خۆی ناسیوەو خۆیی بەلاوە پەسەند بووە. رێزی خۆیی لە ترۆپکی رێزی مرۆڤانەدا داناوە، هەر لەو رێزەی خۆیەوە مامەڵەی شیعری لەگەڵ بابەتو کەسایەتیەکاندا کردووە. ئەمە وای لە نالی کردووە بەردەوام پەیوەندی مادیو کۆمەڵایەتی دروست برەو پێبدات. لێرەوە توانا

گەورەکەی خۆی بۆ ئەو بەرهەمو داهێنانانەی، تاوەکو ئەمڕۆ لە بەردەستی ئێمەدان خستۆتە کار، کە ئەتوانرێت خودی ئەو کەسایەتیە دیارەی تیادا دەستنیشان بکرێت. ئەوەندەی لە ناوەڕۆکی شیعرەکانیەوە بۆمان ئاشکرایە، کە رۆشنبیری بریتیە لە دوو بەشی سەرەکی: بەشێکیان مادیەو ئەویتریان کۆمەڵایەتی. ئەم دوو لایەنە هەردووکیان لە شیعرەکانی نالیدا ئەتوانرێت جیابکرێنەوە. بەشە مادییەکەی هەموو ئەو شاکارانە ئەگرنەوە، کە باس لە بنەو بارگەی مادی مرۆڤو ژینگەو سروشتو هەر بابەتێکیتری مادی ئەکەن. بەشەکەی تریان هەموو ئەو شێوازانە ئەگرێتەوە، کە بریتین لە خۆشەویستیو سۆزی دەروونو مامەڵەی کۆمەڵایەتیو ئاینیو بەرەوڕوو بوونەوەو بە تەنگەوە هاتنو هەموو بوارە مرۆڤایەتیەکانیتر.

ئاستو توانای نالی لە بواری بونیادی رۆشنبیری، شارستانیەوە نزیکمان ئەکاتەوە، ئەکرێت، کە وەک بنەو هێزێکی کارای ئەو بوارانە لێی بڕوانین. نالی، وەک هەر مرۆڤێک لە هەوڵی دروستکردنی پەیوەندیدا بووە. لەم روانگەیەوە چەمکەکانی رۆشنبیری، شارستانی، کولتووری کۆمەڵگەی لەو روانگەیەوە وەک **ئەلفابێت** رێکخستووە. ئەم لایەنە لە سەرەتاکانی ژیانی خۆیەوە دەست پێ ئەکات، بەوەی، کە بەردەوام لەگەڵ نووسینو کتێبو خوێندنەوەدا ژیاوەو مامەڵەی کردووە، شارو دێهاتو مامۆستای بە توانایی دۆزیوونەتەوەو هەوڵی تەواوی فێربوونیداوە، ئەمەش بۆتە ئەو فاکتەرەی، کە دیدو هەڵوێستێکی تایبەتی لە بواری رۆشنبیری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکەیدا پێبدات، بەو جۆرەی ئێستا، کە ئێمە ئەتوانین لێی بدوێین. زۆر جار وای لێهاتووە بۆ دەوڵەمەند بوونی بیرو گەشەی ئەو رۆشنبیریە پەنای بۆ بابەتی بێگانە بردووە، یاخود هەوڵی کێبەڕکێی زیندووی بە بنەمای لەگەڵدا داون،

وەک ئەو شیعرانەی بەرەورووی کەسانی بە تواناو دەسەڵاتدارو شاعیرانی بە توانای پێش خۆی کردوونەتەوەو سەرکەوتنی تیادا بە دەست هێناوە.

لەو ئەزموونە بەرفرەوانە روونبیریەی نالی، کە خۆی خاوەنی بووە هەوڵی بە دەست هێنانی زیاتری تیادا داون، تاوەکو گەیاندوونی بە ترۆپکی سەرکەوتنی ئەو کێبەرکێیە. هەوڵیداوە خۆی زاڵ بکاتو بێ ئارایش لە سەر شانۆی ژیان رۆڵی بەردەوامی راستیو خۆشەویستیو پێگەیاندنو گەشەو پێشکەوتنو گۆڕانکاری ببینێت. زۆر جار لە داڕشتنی ئەو رۆڵە شارستانیە راستەقینەیەدا چەندین ئاماژەی لاوەکیو نادیارو هەژێنەری، وەک مەتەڵ لە بیری کۆمەڵایەتی ئێمە ئەدات. نالی ئەو ئاماژانەی کردۆتە کۆمەڵە بنەمایەکی ستوونی بۆ پێگەیاندنی بیری مرۆڤایەتی، تاوەکو رۆشنبیری، شارستانی کۆمەڵگەی پێ دەوڵەمەند بکات. ئەمەش لەو توانا بێ هاوتایەی نالیدا دیارە، کە ئەچینە نێو بەرهەمەکانی ئەم داهێنەرەوە. ئەو کاتە ئەکرێت لە هەژاندنی هزرمانەوە پرسیار بکەین، یاخود چەندین پرسیار یەخەمان ئەگرێت، بەوەی نالی لە رووی رۆشنبیری، شارستانی، کولتووری خۆماڵیەوە هەوڵیداوە بنەیەکی تۆکمە داڕێژێت، زۆر بواری ئەم لایەنە بکاتە بەڵگەو بۆ نەوەکانی پاش خۆی بە جێبهێڵێت.

لە سەرەنجامی وردبوونەوەو بەدواچوونەکاندا بۆ بنەماکانی داهێنان لای نالی، دوو رای جیاواز دەرئەکەون. یەکەمیان لەو رایە نزیکمان ئەکاتەوە، کە دیاردەی داهێنان لای ئەم شاعیرە سایکۆلۆژی- کۆمەڵایەتیە، نەک سروشتی. چونکە، ئەگەر سروشتی بوایە دەستەواژەیەکی تەمومژاویو توانایییەکی سروشت پێدراوی نادیار دەرئەکەوت، کە داهێنان بە لادانو ناوازە ناوزەند کراوە. لە باسو خواستی ئاسایی

رۆژانە تێپەڕیان نەئەکرد. لەبەرئەوەی گرنگی بە فاکتەری دروست بوونو پێگەیاندنی رووی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری، شارستانی نەئەدا، تاوەکو بەدواچوونی بنەما هزریەکانی داهینانو هەلی بواری ژینگەی مادیو کۆمەڵایەتی بەرفراوانتر بکات. داهێنان کردارێکی هزری (مۆخە) وەک هەموو ئەرکەکانی تری هزر وایە، کە مامەڵە لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری مادیو کۆمەڵایەتیدا ئەکاتو بنەی رۆشنبیری دائەڕێژێت. ئەوەی ئاشکرایە، کە لە بەرهەمەکانیدا نالی لە هەوڵی بەردەوامی شرۆڤە کردنی دەوروبەری مادیو کۆمەڵایەتی خۆیدا بووە. لە هەر رووداوێکی خۆشو ناخۆشدا، لە فاکتەر گەڕاوە. لە هەمان کاتیشدا هەوڵی داوە لە رێگای ئەو توانا زمانەوانیە زۆرەیەوە بە شێوازێکی داهێنەرانە بەرەو سۆنگەی پەسەندیان ببات. ئەمەش رەسەنایەتیەو بە یەکێک لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی داهێنانەوە وابەستەیە. بیری هزرمەندانەی داهێنەرانەو رەسەنایەتی واتای دەگمەنی ئەگەیەنێت. ئەمەش خاڵی هاوبەشە بۆ ناسینی بواری داهێنانو داهێنەر، کە بە بەردەوام درێژە پێدانی خوێندندنەوەی خودی شاعیرانەی، ئەو واتاو سەلیقە جۆراوجۆرەی تیادا دیاری کردووە. بە تایبەت لە بوارەکانی خستنەڕووی ئاستەنگو بەدواچوونو چارەسەردا بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی گشتی بۆ گەشەو پێشکەوتنو گۆڕانکاری لە پێگەیاندنی کەسایەتیو کۆمەڵگەدا برەویان پێبدات. داهێنانی نالی لەو پێودانگەوە دیارە، کە لە فاکتەرە مادیو کۆمەڵایەتیەکانو چەسپاندنی توانای بەرفرەوانی بیری خۆیەوە بووە بە خاوەنی بڕیاردان. بەم فاکتەرانە توانیویەتی نەمری خۆی لە داهێنانە پڕ واتاکانیدا بهێڵێتەوە. لە ئەنجامی ئاوێتە بوونی ئەو تواناو هێزو پێزە هزریو فیسیۆلۆژیو جەستەییەی خاوەنی بووە، کە ئەم بوارەی لەگەڵ زانستو

دیدی کۆمەڵایەتیو سروشتی خۆیدا کردووە بە بنەمای ئەو داهێنانەی، کە ئێمە لە شاکارەکانیدا بەرچاومان ئەکەون.

لە بواری زمانەوانیدا دەرئەکەوێت، کە نالی دەسەڵاتێکی بەرفرەوانو گەورەی لەو بوارەدا هەبووە. لە ئەنجامی ئەو شارەزاییە زۆرەوە پەیدا بووە، کە لە زمانەکانیتری، وەک تورکیو عارەبیو فارسیدا هەیبوون، تاوەکو ئەو رادەیەی بنەما زانستیەکانی ترۆپکی زمان ناسی لێ گواستونەتەوە بۆ ناو زمانی کوردیو سنووری تواناى خۆیی پێ دیاری کردووە. لە رێگەی گۆڕینەوەی بارە مادییەکانی خودی زمان بۆ لایەنە کۆمەڵایەتیەکانو بە پێچەوانەوە.

زمانی نووسینو ئاخاوتن جیاوازن لە یەکتر. نالی ئەم جیاوازیەی دەستنیشان کردووە. چونکە ویستوویەتی بنەو پێکهاتەی نەتەوەییو زمانەوانی کوردی داڕبڕێژێت. بۆ ئەو سەردەمە زمانی کوردی لە ئاستی خۆی زیاتر بەرزکردۆتەوە. ئەم کارەی، کە کردوویەتی هەژێنەرەکانی ژێی دەنگو گۆڕانکاریو شێوازی ئاخاوتنی هێناوەتە کایەوەو بەرەوڕووی هەموو نەتەوەی کردۆتەوە. بە جۆرێک، کە زمانی نووسی کردووە بەو پێودانگە، کە رەوشی ناوازەو دزێو بخاتە روو.

ئەو کاتانەی ئەم مەزنە بەیتێکی شیعری نووسیووە گوێی بە دەوروبەرو هێرش نەداوە بە هەندی راستی بەردەوام بوون، بۆیە توانیویەتی رەوشی زمانەوانی پەرە پێ بداتو بەرەو کاریگەریو بەرەوڕوبوونەوەی راستەوخۆی دەرەکی بکاتەوەو چاودێریی گەشە کردنەکە بکات. لە نامەو نووسینەکانی بۆ دەرەوەی کوردستان ئەم خەسڵەتەیان تێدا بەدی ئەکرێت. هەر چەندە برێکی کەمی بە دەست ئێمە گەیشتووە.

زمان بنەماو پێکهاتەی بوونی نەتەوایەتیە. بۆیە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەدا دەرکەوت، کە نالی چەند ئاستێکی گرنگی لە بەکارهێنانو داهێنانی زمانی نووسینی کوردیدا رەچاو کردووە. بنەمای چاودێری لە بەرهەمەکانیدا ئاشکران، کە بریتین لە دوو بەش: بەشێکیان کرۆکێکی کۆمەڵایەتیان هەیە، کە لە چالاکی زمانەوانی کۆمەڵایەتیدا رەنگ ئەدەنەوە. بە تایبەتی لە بواری خوێندندا.

بەشی دووەمیان بریتیە لەو ئاستە دیاریکراوەی، کە لە هۆکارە مادیەکانەوە گواستویەتیەوە بۆ پەیوەندی زیندوو، چ بە بەراورد کردن، یاخود وەک بێژەرو گوێگر، یاخود وەک گواستنەوەو تێگەیاندنی پەروەردەیی. لە بەشی دووەمدا چوار خاڵی ئاشکرا لە **کاتو سەردەمو نووسینو درکاندندا** لە بەرهەمەکانی نالیدا تێبینی ئەکرێن.

ئاستی هەڵسوکەوتی زمانەوانیش لای نالی دوو بەشە. بەشێکیان بۆ بەرزی ئەو کاردانەوانەیە، کە بە بابەتەکانەوە لکاوە، وەک هەڵبژاردنی ئەو پەیوەندیانەی لە دارشتنی زمانەوانیدا کردوونی بە ئاماژەو بابەتی نوێی پێ دروست کردوون. بەشەکەیتریان پابەندی بەشی یەکەمە، وابەستەی ئەو لایەنەی کردووەو توانیویەتی بە شێوازی هەڵوێستەوەی بلکێنێت.

ئاستی دەقو واتاش، کە لای نالی بریتیە لە پێکەوە لکانی بابەتەکان وەک ئامادە کردنی بابەتو دارشتنو پێکەوە لکاندنی روونکردنەوە، یاخود واتاو مەبەست گۆرین بە دیاری کردنو بەکارهێنانی وریایانەی بواری ئاماژە کردن. ئەم ئاستەیان لە تێروانینی هەموو بابەتەکانی نالیدا لە رواڵەتو کرۆکو لایەنە دەروونیەکاندا

دەرئەکەون. چۆنیەتی ئاستی باوەڕو دەربڕینی ئەو بنەمایانەی بە بەراورد کردنێکی شیاستەوە هەڵبژاردووە.

تێڕوانینی سۆسیۆلۆژیانە لە بەرهەمەکانی نالیدا زۆر بەرفراوانە، کە ئەکرێت چەندین سۆنگەی تیادا دەەستنیشان بکرێت. لەو زاراوە سۆسیۆلۆژیەوە نزیکمان ئەکاتەوە، کە ئاماژە بە رێکخستنە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگە ئەدەن. ئەم لایەنەی لە رێگای تێبینیو هەستو هەڵسوکەوتو گەشەی بیری خۆیەوە پێ گەیاندوونو بە پێی کاتو سەردەم گۆڕانکاری بە سەردا هێناون. لەو تێڕوانینەوە دەرئەکەوێت، کە نالی خۆی لە تۆڕێک پەیوەندی لە چەمکە کۆمەڵایەتی، ئایینی، ئابووری، نیشتمانی، زمانەوانی... هتد ئاڵاندووەو شێوە بازنەیەکی دامەزراوەیی کۆمەڵایەتی بۆ تاکەکەس داڕشتووە، کە ئەتوانرێت، وەک ئاماژەی پێکهاتنی بونیادو سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە بۆ ئێستاو داهاتوو سوودمەند ببێتو بەردەوام خەسڵەتەکانی پێگەیشتنی تیادا دەستنیشان بکرێت.

رێچکەی مەبەستی نالی هەژاندنی کرداری هەڵسوکەوتو رێکخستنی ژیانی مادیو کۆمەڵایەتی بووە. دیدی سۆسیۆلۆژی لای ئەم شاعیرە لەو بوارانەدایە، کە لایەنەکانی کەسایەتیو روونبیریو داهێنان لە رێگای زمانەوە بۆ واتایەکی شایستەو پەسەندی بواری ژیانی کۆمەلایەتی بگوێزێتەوە. کردوونی بە واتاو بنەمای زانستی کۆمەڵایەتی بۆ نەوەکانی سەردەمی خۆییو پاش خۆی، کە تاوەکو ئێستا بە بەرزی ماونەتەوە.

نالی چمکێکی چۆنیەتی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤایەتی دیاری کردووە. لەو خاڵەوە بە شێوەیەکی ئاشکراتر لە بەرهەمەکانیەوە چۆنیەتی بەدەستهێنانی

خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤی لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا دەستنیشان کردووەو بیری گەشە سەندنی پێوە لکاندوون، تاوەکو ئەو کاتەی کردوویەتی بە پێناسەی بە بنەما لە پێکهاتەی کۆمەڵگەدا. توانیویەتی چەمکەکانی رۆشنبیری، شارستانیەتی، کۆمەڵایەتیمان بۆ ئاشکرا بکات. جگە لەوە توانیویەتی پێگەو رێوگەی شیعری کلاسیکی کوردی لە ناوچەکەدا دیاری بکاتو بیکاتە جێگەی سەرنجی دەوروبەر. نالی زۆر لایەنی بنەمای سۆسیۆلۆژی کەسایەتی لە بەرهەمەکانیدا هەڵچنیووە. لەو پێگەو رێگاو توانای روونبیریە کۆمەڵایەتیەی باوەی ناوخۆو دەوروبەری خۆیی تێکەڵی پێکهاتەی کەسایەتی کۆمەڵایەتی کردووەو کردوونی بە کارلێکێکی کارا بۆ دەوڵەمەند بوونی ئەزموونی گەشە کۆمەڵایاتیەکان. بە تایبەت ئەوانەی ئاماژەی واتاداریان بۆ ئەو مەبەستە هەیە. لێرەوە نالی توانیویەتی لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتیدا بیگونجێنێتو بەردەوام لە دیدوبۆچوونو واتای نوێدا خۆیمان لەگەڵدا نوێ بکاتەوە.

لە کۆتاییدا دیارە هیج باسو لێکۆڵینەوەیەک بێ کەمو کورتی نابێت. ئەم باسەی ئێستاش بێ ئەو لایەنە نایەتە بەر. بۆیە هیوادارم کەسانیتر بە دیدو بۆچوونی شیاوترو زیندووترو بە چاوێکی رەخنەگەری بونیادنەرانەوە بتوانن باسو لێکۆڵینەوەی گەورەو بە هێزوپێز تر بۆ کەنووی فەرهەنگی نەتەوەکەمان دارێژن.

## سەرچاوەکان


١- د. بني يوسف، الاسس الفسيولوجيه للسلوك، چاپی یەکەم، چابخانەی دارالشرق للنشر، بيروت، ٢٠٠٨.

٢- حلمي، مليجي، علم النفس المعاصر، دار النهضة المصرية، چاپی دووەم، ١٩٧٢.

٣- دورکهایم، علم الاجتماع والفلسفة، ترجمة حسن أنيس، چاپخانەی أنجلو المصرية ١٩٨٠.

٤- د. معن خليل، علم الاجتماع و الفن ، چاپخانەی دارالشرق عەمان، ٢٠٠٠.

٥- نوری جەعفەر، الاصالة في مجال العلم والفن، چاپخانەی التحرير، بغداد، ١٩٧٩.

٦- د. نوری جعفر، الفكر طبيعته وتطوره بەشی دووەم چاپخانەی التحرير، بەغداد ١٩٧٧ .

٧- د. عبدالرحمن محمد عيسوي، دراسات في علم النفس الاجتماعي، چاپخانەی دار النهظة، بيروت، ساڵی ١٩٧٤.

٨- د. قيس و د. عبدالمنعم الحسني، النظريات الاجتماعية، چاپخانەی الموصل، ١٩٨٥.

٩- د. قيس نوری، الحضارة والشخصية، چاپخانەی الكتب للطباعة والنشر، زانکۆی موسڵ،١٩٨١.

١٠- کلاید کلاهون، الانسان في المرآة، ترجمة د. شاكر مستەفا سەليم، چاپخانەی، الاهلية، بەغداد،١٩٦٤.

١١- ليفی شتراوس، مقدمة في الانثروپولوجيا الاجتماعية، وەرگێڕانی د. شاكر مستەفا سەليم، چاپخانەی شؤن الثقافية للنشر، بەغداد، ١٩٨٣.

١٢- لوبون غوستاف سر تطور الامم، ترجمة أحمد زكي زغلول باشا، دارالنفاس، بيروت، لبنان،١٩٨٧.

١٣- معجم العلوم الاجتماعية، أعداد نخبة من الاساتذة المصريين، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٥.

١٤- مەلا عەبدولكەريمی مودەڕيس، ديوانی نالی، چاپخانەی کۆڕی زانياری کورد، بەغداد،١٩٧٦ .

١٥- محمد سعيد مضية، البايولوجي الاجتماعي في الابداع الفني، مجموعة مقالات مترجمة عن الانكلزية، دار إبن رشد للنشر والتوزيع ، عمان، ئوردون، ١٩٩٨.

١٦- النكلاوي، التغير والبناء الاجتماعي، چاپخانەی قاهره الحديثة، ميسر، ٢٠٠١.

١٧- قاسم حسين سالح، الابداع في الفن، چاپخانەی دار الشؤن الثقافية العامة، چاپی دوەم، بەغداد، ١٩٨٦.

١٨- عاطف وصفي، الثقافة والشخصية، چاپخانەی دار المعارف ممصر، چاپی دووەم ١٩٨٧.

١٩- محمد حماسة عبدالطيف، اللغة وبناء الشعر، قاهرة، ١٩٩٢.

٢٠- سعدالدين كليب، مدخل الى التجربة الجمالية، الهيئة العامة السورية للكتاب، ديمشق،٢٠١١، ص٢٥.

21.- Ason Griff , the recruitment and socialization of artis , london , 2010.

22.- Breese, urbanization , london , 1996.

23.- E.hardd, the sociology of urban living routledgeand. keganpau,london .

24.- Henslin , jamens , essetialsof sociology , perss, London , 1996.

25.- mayar, Emotional Intelligence Imagination,Congnition and presonality , london , 2009.

26.- Ogbqren , Nimakoff , hand book of sociology , london , 1991.

27.- Paul. R.E. eadings in urban sociology , london , 1988 .

28.- RoosFitzoerald , social chenge , london , 2001 .

29.- Richard , Schafer , macraw sociology , newYork , 1992 .

سەرچاوەگشتیەکان

30.- www.ahwar.org

31.- www.wikipedia.org